# لە شاخەوە تا شار



## شیعری نوێی کوردی

ئامادە کردنی:
فەخرەدین ئامێدیان

گۆران
شێرکۆ بێکەس
ڕەفیق سابیر
عەبدوڵڵا پەشێو
جگەرخوێن
هێمن
حەسیب قەرەداغی
سوارە ئیلخانی زادە
کەژاڵ ئەحمەد
فەرهاد شاکەلی
ژیلا حوسێنی
و ...

# له شاخه‌وه تا شار

«شیعری نویی کوردی»

**ئاماده کردنی:** فه‌خره‌دین ئامێدیان

**ده‌رهێنانی ناواخن:** فه‌خره‌دین ئامێدیان

**ده‌رهێنانی به‌رگ:** ناسێح ره‌حمانی ـ په‌رتووک

**پیتچن:** سه‌یران په‌رویزی

**نۆره‌ی چاپ:** یه‌که‌م

**تیراژ:** ١٠٠٠ به‌رگ

په‌خشانگای ئازادی

سلێمانی ـ به‌رده‌رکی سه‌را ـ چوارچرا

ته‌له‌فوون ٠٦٧ ٠١٥٧٥ ٧٧ ـ ٠١١٢٨٣٨٨ ٧٣

## پێرست

## پێشەکی

شیعر پرۆژەیەکی شۆڕشگێڕانەیەو مەبەستی گۆڕانی سیمای دونیایە. شیعر ئیسپارتاکووسی یاخی بووە لە هەرچی نابەرامبەری و کۆنەپەرستییەو سەری هەرچی کۆڵدانە لە جەستەی ویدەکاتەوە. شیعر مرۆڤێکی یاخییە کە قەد لە بەرامبەر پاوەنی یاسا سەردانانەوێنێ و هیچ یاسایەکی ئەم جیهانە، ناتوانێ بیبەستێتەوە.

شیعر تەقینەوەیەکە لە زاردا بۆ هەڵوەشاندنی پێوەندی مەنتیقی لە نێوان وشەکان.

شیعر نابێ دامرکێ و ئەهوەن بێتەوە. هەرچەن قەد گەورە نابێ، بەڵام قەد گوێ نانێتە مستی کەس. منداڵێکی لاسارەو روومەتی هەرچی دیواری ئەم جیهانەیە خوێناوی دەکاو خەو لە چاوی شووشەکان دەڕەوێنێ و ئارام لە گیانی دەرگاکان دەستێنێ.

بە بیری قازانج نابزوێتەوەو بە هۆی زیانیش ناپرینگێتەوە. شیعر لە هەرچی سوودو زیانە بێزی دێ و ناکەوێتە توخنیان.

شیعر شۆڕشێکی دەروونیە دژ بە شتە خوو پێگرتووەکان.

کۆمەڵگا تا نەگۆڕدرێ پێش ناکەوێ؛ شیعر دژ بە نەگۆڕان دەوەستێ و لە پێناویدا خوێنی خەڵات دەکاو ئازار بە گیان دەچێژێ و لە قوربانگادا بە لێوی بە بزە، سەر بۆ ئیبراهیمی هیوا نەوی دەکاو چاو دەبڕێتە نێو چاوانی دوارۆژی رووناک و لە نێو دڵیدا رۆدەچێ، تا لە گەرووی سبەینێی کامەرانیدا بێتەوە دونیا و لە سینگی بەرامبەری مرۆڤدا شیری گیانپرژێن بمژێ و لە ئامێزی

خۆشەویستیدا بژیتەوە؛ چونکە بڕوای قایەمی شیعر وایە کە: «باشتر لەوەی لەمەو دوا دێت، نییە».

شیعرێک کە دەگەڵ سەردەمەکەی خۆیدا بە شەڕ نەیێ، شیعر نییە.

شیعرێک لە بیری ڕاگرتنی حورمەتی کۆمەڵ، خوو و خدەکانی، باوەڕو خوا دەسکردەکانی بێ، شیعر نییە؛ پەخشانێکی ئەفیوونییە کە چاوی کۆمەڵگا دەکاتە خەو تا دزانی شەوبێداریان بکاتە سەر.

**شیعرو دەوڵەت:**

دەوڵەت پیاوێکی تەژەی مەندەبۆری چاوپیسی چاوچلێسە کە بینی لە حەنای بۆنی خۆشەویستی کپەو بێزی لە ئەوین دێت. دەوڵەت چاوچنۆکێکی چاونەزێرە کە هەموو شتی بۆ خۆی دەوێ. دەوڵەت ترسنۆکێکی خوێڕییە کە لە ورتەی منداڵە ساوایەکیش ڕۆحی دەتەوقێ. لە ترسان نابزوێ تا لە شووشەدا دەمرێ.

دەوڵەت تا لە چۆرتکە نەدا ناجووڵێ. کە بۆنی قازانجی گەیشتە کەپۆ، لە هەمبەر هەموو کەس دەکەوێتە کلکە سووتە.

خۆشبۆنترین بەرامە لە لای دەوڵەت بۆنی مردارە؛ خۆشترین بەزمی، بەزمی سەربڕینی ئەویندارانە.

دەوڵەت پیرەژنێکی ئەفسوونکارە کە خزاوەتە نێو باخەڵی هەزاران کوڕو کاڵی ئارەزوولێداوی لە گوێچکەی گادا خەوتوو و بە مەرایی و زمان لووسی لە خشتەی بردوون. عفریتەیەکی دهۆبازە کە شەو نەبێ خۆی نانوێنێ؛ چونکە ڕووناکی هەتاو ئەفسوونەکانی پووچەڵ دەکاتەوە.

شیعر، ئەو هەتاوەیە رووبەند لە سەر رووی ئەم گزیکارە لادەداو ڕوومەتی نەحس و پیسی، خویان و ئەفسوونەکانی پووچەڵ دەکاتەوە. شیعر، قەمچێکی

بە سۆیە لە سەر دڵی دەسەڵات. شیعر تانەیەکی بەژانە کە لە سەرچاوی دەسەڵات دەڕوێ و ئارامی لێ دەستێنێ.

شیعر ژانێکی بەردەوامە لە ورگی پڕ لە قینی دەسەڵات. شیعر ترس و دڵەڕاوکێیەکی جەرگبڕە کە هەردەم روومەتی دزێوو ناحەزو پیسی دەسەڵات لە تۆڕی ئینتەرنێتدا بڵاو دەکاتەوەو بە عالەمی دەناسێنێت.

شیعر کێشەیەکی بەردەوام و بێپسانەوەیە لە گەڵ دەوڵەت.

دەسەڵات سەمبۆلی نەجووڵان، تاریکی، گزی، دزی، لە خۆبایی بوون و بە گشتی ئەهریمەنە. شیعر کە خزایە لای دەسەڵات، کە نانی خۆی لە سەر سفرەی پڕ لە خوێنی دەسەڵات بینی، کە تیری زێڕ نیگای ئەنگاوت، ئیدی ئەو شیعرە، با جوانیش بێ، رازاوەش بێ، دەکەوێتە بەر لەحنەتی خوای شیعر. ئەو شیعرەی گەردی ژێر پێڵاوی کرێکارێکی رووتی گۆڕاوە بە تاج‌و تەختی پڕشکۆی دەسەڵات، دوور دەخرێتەوە بۆ تاراوگەی فەرامۆشی.

شاعیر کە پیرو کەنفت بوو[1] کە لە پەلوپۆ کەوت و گەورە بوو، پیری چەتری کێشا بە سەریا، ئەو کاتەیە کە خوای شیعریش چەکی دەکاو گفتی خۆش و لفتی رەوانی لێ دەکاتە قورقوشم.

رەنگە دەسەڵات بتوانێ بە زێڕ یا بە زۆر شاعیر ببەستێتەوە، بەڵام قەد لە وزەیدا نییە شیعریش بێنێتە ژێر رکێفی خۆی. دڵی شاعیر وڵاتێکی هەمیشە بەهارە، بۆیە پەڕەسێلکەکان جێی ناهێڵن. بەڵام کە شاعیر خزایە لای

---

[1] – گەورە بوون‌و پیرو کەنەفت بوونی شاعیر، نەک بە رواڵەت‌و جەستەیە، بەڵکوو مەبەست لە پیر بوون تەسلیم بوونە لە بەرامبەر حەزو داخوازە دونیاییەکان، بە پێی سوودو قازانج بیرکردنەوەو جووڵانەوە. رەنگە زۆر شاعیرمان بێ لە تەمەنی ٣٠ یا ٤٠ساڵان یا لەوەش کەمتر تووشی پیری بێ. کەچی زۆربەی شاعیرە گەورەکانمان لە تەمەنی ٦٠و ٧٠ و هەشتاشدا وەکوو لاوێکی بەگوڕ شیعریان تاو دەدەن‌و بێجگە لە راستی ئاوڕ لە هیچی‌تر نادەنەوە.

دەسەڵاتەوە، زستانی دڵی دەگاو شیعرەکانی پۆل پۆل دەفڕن و روو لە بەهارێکی‌ترو ئاسمانێکی‌ترو شاعیرێکی‌تر دەکەن.

**شیعر و کۆمەڵگا:**

شیعر بەر لە کۆمەڵگای خۆی سەفەر دەکاو ئاسۆ روونەکان بە دی دەکاو هەورازەکان دەناسێ و چیاکەن دەبینێتەوەو دەکەوێتە تەک رووبارەکان و دەریاکان دەگەڕێ و دێتەوە بۆ کۆمەڵگای خۆی و دەبێتە رێنما و رێبەر. شیعر بزوێنەری کۆمەڵگایە بۆ جووڵان، رۆیشتن، نەخەوتن و نەوەستان.

شیعر پزیشکێکی گەڕۆکە، زامە کۆنەکانی کۆمەڵگا -کە بە ئەفیوونی دەوڵەت داسەکێنراوە- دێنێتەوە سوێ، تا کۆمەڵگا خۆی بزانێ ئەو زامەی کە بە رواڵەت سەری لێکناوەو بە هۆی ئەفیوونی دەسەڵاتەوە ئێشی نەماوە، چۆن کرم و زووخ لێداوەو شێرپەنجەی گزی و فزی تەشەنەی تێدا کردووە؛ کەواتە بۆ دەرمانی خۆی، رابێ و خۆی لە هەرچی ئەفیوونە پاکژو جەستەی لە هەرچی میکرۆبە خاوێن کاتەوە.

شیعر ئەسپێکی خۆشبەزو سەربزێوە کە کۆمەڵگا لە کۆڵ دەنێ و بە تاو دەرو دەشت و چیاو کەژ دەریاو رووبارەکان دەبڕێ و بەرەو کام ئاسۆ روونە دەیبا.

شیعر قەد کۆن نابێ. قەد بەرگی کۆن لە بەر ناکات. شیعر رووبارێکی بە هاژەیە کە هەردەم لە تازەبوونایە.

دابونەریت و فەرهەنگەکان هەوێنی مانەوەو وەستانن؛ شیعر دژی هەموو دابونەریت و فەرهەنگێکە؛ شیعر دژ بە وەستان و کۆن بوونە.

شیعر ئەویندارێکی دڵسووتاوی چاو پڕلە خوێنە کە لە هەر کوێ، لە هەر کۆڵانێک، لە پشتی هەر دەلاقەیەک، لە سەری هەر کانیاوێک، لە سەر هەر بانێک، خۆشەویستەکەی (کۆمەڵگا) بە دی کا، هانی دەدا و بە بەڵێنی رۆژی خۆشی پڕ لە هەتاو و ژیانی ئازادو بەختەوەر، رەدووی خۆی دەخاو دنەی

دەدا تا لە ئاغای نەگریسی چاوپیس سڵ نەکاو لە هەمبەری کز و سەرشۆڕ نەبێ.

شیعر لە ئەو پەڕی ساکاریدا سەخت و دژوارە؛ لە ئاستی هەژارو رەش و رووتاندا، نەرم و نیان و سانایە، کەچی لە ئاستی ملهۆڕو زاڵم و سەرکەشاندا توورەو توندو هەڵچوو و بێبەزەییە.

هونەر بە گشتی و شیعر بە تایبەت ئاسۆیەکن لە ناخی مرۆڤدا بۆ گەیشتن بە راستی.

شیعر هەتاوێکە کە گەر شوێنێک نەبێ روونی کاتەوە، پووچ دەبێ و دەکوژێتەوە. شیعر کۆترێکی بێلانەیە کە دەبێ لە نێو هێلانەی دڵی کۆمەڵدا بحەسێتەوە.

**شاعیر کێیە؟**

شاعیر مرۆڤێکی جن لێداو و شەیدایە کە بە زاری خەڵکی ئاسایی ناپەیڤێ؛ بەڵکوو بە شەیداییەک -کە لە سۆنگەی سرووشی ئاسمانییەوە تووشیاری بووە- دەئاخێوێ. لەو سۆنگەوە شاعیر لە یاسا ئاساییەکانی دادوەری بەری دەبێو دەکەوێتە قۆناغێک لە نێوان پێشگۆیی و شەیداییەوە؛ کە هەندێ جار ئەمیانەو بڕێ جار ئەویتریان و جاربە جاریش هەردووکیان.

ئەفلاتوون لە بەشێک لە نامیلکەی «فایدرۆس»دا لە زمان سوقراتەوە دەڵێ: «جۆری سێهەم لە شەیدایی، حاڵی ئەو کەسەیە کە خواکانی شیعرو هونەرو زانست ئەفسوونیان کردووە. ئەم ئەفسوونە دەیخاتە دۆخێک کە رۆحی پاکژو ناسک و بە هەست دەکاو وای دێنێتە سەر شەوق کە چریکەی ئەویندارانەو دڵڕفێن و هەست بزوێن هەڵدەدا. رۆحی بەم ئاوازانە، هەڵس و کەوتی قارەمانانی پێشوو بۆ راهێنانی داهاتووان دەکاتە بەستەو دەیهۆنێتەوە».

شاعیر ئەوەی کە دەیهۆنێتەوە، لە لای خۆی هونەر نییە ، ئیلهامە، وەحییە. شاعیر تا ئەو دەم کە لە شەیداییدا بێ، لە ئافراندنی هونەریدا پشت بە هەست

و عاتیفەی دەبەستێ. سەنعەتی شیعری بە هۆی ئەو شەیداییەوە دەخولقێ، بۆیە پێویست ناکا تەنانەت بیری لێ بکاتەوە.

**بەڵام شیعری کوردی**

شیعر نوێنەری بارودۆخی سیاسی، کۆمەڵایەتی، هونەری و تەنانەت ئابووری ئاخێزگەکەیە. ئەمە زۆر سرووشتییە کە لە وڵاتی ئەنفال و کیمیاو شەڕو بوردوماندا «مارگوت بیگل» نەیەتە دونیاوە. لە وڵاتێکدا کە رۆڵەکانی تا چاویان کردۆتەوە دەنگی بۆمب و نەڕەی داگیرکەرو هەنسک و ئاهی دایک و باوکانی جەرگ سووتاو رۆحی سواخ داون، وڵاتێک کە ناوی منداڵانی «هێرش‌و شۆڕش‌و هاوار» بێ، دیارە چەن بیری شۆڕش‌و سەربەستی کونج و قوژبنی رۆحی تەنیون؛ بۆیە ئاوەها نەتەوەیەک، رۆڵەی وەکوو پەشێوو شێرکۆ بێکەس و لەتیف هەڵمەتی دەبێ.

رەنگە زۆربەی شیعری کوردی تا نزیکی ساڵی ٢٠٠٠، شیعری شۆڕش و خەبات بێ؛ شیعری نەفرەت لە زۆردارو داگیرکەر، شیعری ئاوارەیی و زیندان، لە هەمان کاتدا شیعری خۆشەویستی.

بە بڕوای من شیعری نوێی کوردی لە چەن بواردا چالاکی هەبووە:

**١- شیعری خۆشەویستی و دڵداری**

بە گشتی سەرنجی شیعر بەرەو لای پاکی و خاوێنی و هێمنی و -گرینگتر لە هەموویان- چێژو لەززەتە. بە بڕوای من گرینگترین هۆی مانەوەو بەردەوامی ژیان چێژە؛ چێژ لە هەرشتێک: پووڵ و پارە، ژن و ئافرەت، هێزو دەسەڵات یاخۆ بەرزی ئاکارو رەوشت و گەیشتن بە پلەو پاگەی عیرفانی. بێگومان چێژ بەهێزترین دنەدەرو بزوێنەرە بۆ بەردەوامی ژیان؛ جا نەک بە تەنیا لە مرۆڤدا بەڵکوو لە هەموو گیاندارێک. رەمزی مانەوەی بەرەی گیانداران چێژی جینسی و خواردنە، هۆی مانەوەی کۆمەڵگا، چێژی گەیشتن بە دەسەڵات، هێمنی و بەختەوەرییە. لەززەتێک کە لە پەرستندایە هۆی

بەردەوامی ئایینە لە کۆمەڵگای ئینسانیدا. بە گشتی و بە کورتی ئەگەر لەززەت نەبێ، نە ژیان دەمێنێ و نە کۆمەڵگاو نە ئاسەواری مان و بوون.

بەڵام لە نێو هەمووی ئەو لەززەتە دونیاییانەدا هیچیان ناگەنە لەززەتی دڵداری. ناگەنە ئەو خۆشییەی کە ئاشق لە خۆشەویستەکەیدا دەتوێتەوەو خۆی لە بیر دەکاو وەکوو پەپوولەیەک بە دەوری شەمی وجوودی دڵدارەکەیدا دەسووڕێتەوەو لە ئەنجامدا هۆشی لە خۆی دەبڕێ و گڕەکانی شەم دەگرێتە ئامێزو گڕی دڵی دادەمرکێنێ و فێنکی وجوودی دەگرێ و لە خۆشەویستیدا دەبنە یەک و دابڕان و جیایی دادەبڕن و لێی جیا دەبنەوەو دەبنە یەک و دوو ناهێڵن و ئەوەی نامۆ بێ لە نێوانیاندا بە گڕی ئەوین دەیسووتێنن و نە ئاشق دەهێڵن و نە مەعشووق و هەر دوو دەبنە یەک.

شیعر کە هەڵوەدای دیتنەوەی پاکییە، کوو دەتوانێ لەم بەزمە دڵڕفێنە بپرینگێتەوە. شیعر کە خۆی ئەوینەو ئاخێزگەکەی وڵاتی دڵەو بزوێنەری، خوای خۆشەویستییە، لەم بەزمە خۆشەدا دەبێ چ حاڵێکی بێ.

لە ئەدەبی هەموو نەتەوەکانی دونیادا بەشێکی گەورە لە بابەتی شیعرەکانیان دڵداری و خۆشەویستیە. ئاوێتەیی شیعرو دڵداری بە جۆرێکە کە دەمانخاتە ئەو گومانەوە کە ئەم دوانە یەکێکن لە دوو جەستەدا؛ یاخۆ لفە-دوانەیەکن کە لێک دابڕاون؛ یاخۆ یەکیان سێبەری ئەویتریانە.

بەڵام -هەروەک ئاماژەمان پێکرد- شیعر گراوی پاکی و خۆشەویستیە. جا چ شتێک دەتوانێ پاکتر لە ئەوین بێ. کەواتە شیعری کوردیش وەک شیعری هەموو نەتەوەکانی‌تر ئۆقرەو ئارامی بە دڵداری دێت و هیچی‌تر. باس لە دڵداری فێنکیەک بە گیانی دەبەخشێ و هێزی بەپێز دەکا بۆ پەڕاندنەوەی گەلی داماوی ژێرچەپۆک لە بۆمب و کیمیاو ئەنفال و تاراوگەو زیندان.

**٢- شیعری نیشتمانی و نەتەوەیی**

نیشتمان دایکی دووهەمی هەرکەسە. نیشتمان ئەو شوێنەیە مرۆڤ تێیدا چاوی بە سەر دونیا دەکاتەوە، پەروەردە دەبێ، فێر دەبێ چۆن زاری بۆ دەربڕینی مەبەست بگێڕێ.

نیشتمان مندالانی رادێنێ چۆن سەربەرز بژین. نیشتمان زارۆکانی فێری دلداری دەکا. بە دەرکەوتنی هەتاو رایاندێنێ چۆن لە سەر پشتی شاخ هەلزنن، لە نێو دلی رووبارا خۆیان بشارنەوە، لە گەل کیژی دارستاندا سەمای قەرەجانە بگێڕن، بە بەرد چاوی حیزی نەگریسان بەردباران کەنو دلی بەرد هەلکۆلن و بۆ رۆژانی لێقەومان هێلانیەک چێ بکەن.

نیشتمان پاژێک لە وجوودی هەرکەسەو چ ئێستاو چ پێشتر گراویەکی تایبەت لە نێوان مرۆڤ و نیشتماندا بووە. ئەم گراوییە لە دوو بەشدا دەنوێندرێ:

١-٢- پەسنی سروشتی کوردستان: رەنگە وامان بە دلدا بێت کە لە ئەدەبیاتی رێئالیستی و کلاسیکی دونیادا نواندنی سروشت کارێکی ئاساییەو قەد ناوی شیعری نیشتمانیشی بە سەردا نەبڕاوە. راستە؛ بەلام ئەوەی کە لە شیعری نوێی کوردیدایەو ئەم شێوازە دەخاتە ریزی شیعری نیشتمانییەوە، مەبەستی پەسنی سروشتە. لە شیعری نوێی کوردیدا، تاراوگە دیاردەیەکی داسەپاوە؛ شاعیر لە ولات راودەنرێ. هۆی راونانەکەش خۆشەویستەکەیە. خۆشەویستێک کە کەوتۆتە بەرچاوی تەماحی داگیرکەر.

شاعیر بەم پێداهەلگوتنەی چەن ئامانجی رەچاو کردووە: گەیاندنی ئەو سووکایەتیە بە گوێی ویژدانە بێدارەکانی دونیا، ترساندنی داگیرکەر، بزواندنی رۆلەکانی نیشتمان و لە ئەنجامدا ئەهوەن کردنەوەی داخی دل. ئێمە ئەم تایبەتمەندییە لە شیعرە رێئالیستی و کلاسیکەکاندا بەدی ناکەین؛ چونکە مەبەستی ئەو شاعیرو وێنەکێشانە خودی سروشت بووە، بە هۆی ئەوەوە کە جوانە، یا لە رێئالیسمدا مەبەست نواندنی ناحەزییەکانی سروشت و کۆمەلگا

بووە بۆ بەرەنگار بوونیان. لە شیعری کلاسیکدا کەمتر ولاتێک کە زێد و نیشتمان بێ دەبینین، بەڵکوو لە هەر شوێنێکدا سروشتێکی جوانیان بەدی کردبێ، بە شیعر یا وێنە رەسمیان کردووە. ئەم دانستەیە -واتە پەسنی سروشتی ولات بەو هۆیە کە باس کرا- تایبەتە بە ولاتانێکی وەکوو کوردستان کە کەوتوونەتە بەر پەلامارو دابڕان.

٢-٢- شیعری شۆڕش: ردنگە ئەم بەشە لە شیعری نەتەوەیی بەشێکی زۆر لە شیعری نوێی کوردی ساڵانی پاش شەڕی جیهانی یەکەم تا نەوەدەکان بگرێتەوە. بزاڤە جۆربەجۆرەکانی کورد لە گەشەو سەرهەڵدانن و کورد خەریکە خۆی دەدۆزێتەوە.

شیعری شۆڕش خۆی لە چەند رەهەند دایە:

١-٢-٢- سەرەتا ئامادە کردنی جڤاکی کوردی بۆ شۆڕش؛ واتە بەخەبەر کردنی گەلێکی خەولێکەوتور و بێ ئاگا.

٢-٢-٢- شیعری تووک و نەفرەت لە داگیرکەران و ناساندن و نواندنی روومەتی دزیو و ناحەزی بە جەماوەر.

٣-٢-٢- شیعری یەکیەتی. لە قۆناغێکدا کە ئاوری شەڕ دایساوەو رۆلەکانی گەل گیانی خۆیان کردووە بە دەستەچیلە بۆ گەشاندنەوەی ئاوری داگیرکەرسووتێن، شیعر لە سەنگەر و لە گۆڕەپانی خەباتا رێنماو رێنوێنی خەباتە.

## ٣- شیعرو براکوژی

لە نەوەدەکانا کە دێ‌ی براکوژی خەریک بوو یەکەیەکە رۆلەکانی گەلی هەڵدەلووشی و دەیەویست جارێکی‌تر جەرگی دایکی نیشتمان ببڕێ و گیانی بێنێتەوە سۆ و ئاواتی سەدان ساڵەی بنێژێ، شیعر سەنگەری خۆی گۆڕی و ئەمجار رووی شیری کردە براکوژی و کۆمەڵگای لە هەڵدێرگای نەمان گەڕانەوە.

### ٤- شیعرو ژن:

بارودۆخی ژن لە رۆژهەلاتی ناوەڕاست بە گشتی و لە کوردستان بە تایبەت گەلێک جێگای رامانە. ئەگەر شەڕی براکوژی ١٠,٠٠٠ پیاوی کردە قوربانی، دەسەلاتی پیاوسالار لە ماوەی ١٥ سالدا -تا ٢٠٠٧- زۆرتر لە ٣٠,٠٠٠ ژنی بە تاوانی ئابڕوو کردۆتە قوربانی حەزەکانی خۆی[٢]. تەنیا سەیرێکی رۆژنامەو کۆڤارەکان روون دەکاتەوە کە کێشەی ژنان لە کوردستاندا لە چ ئاستێکی دلتەزین دایە. هەموو رۆژێ دلی لاپەڕەی رۆژنامەو کۆوارەکان بە خوێنی ئەو کچ و ژنانە سوور بووە کە ویستوویان بە ویستی خۆیان بژین؛ ویستوویانە ئەوانیش وەک پیاوانی کۆمەلگا لە نیعمەتەکانی خوا بەهرەمەند بن؛ بەلام تووشیاری خۆویستی و لووت بەرزی پیاو بوون و لە خوێنی خۆیاندا گەوزین.

دیارە شیعر قەد نەیتوانیوە چاو لە هیچ زولمێک بنووقێنێ، ئەمجارەش چاکی خەبات دەگەل کەسێکدا بە لادا دەکا کە تا دوێنێ پێیدا هەلیدەگوت، پەسنی دەکرد، کرنۆشی بۆ دەبرد، دەستی ماچ دەکردو پێلاوەکانی دەکردە تاجی سەری. بەلام ئێستا کە دەبینێ چەوساوەکەی دوێنێ ئێستا خۆی بووەتە چەوسێنەر، لووتی بە ئاسمان نووساوی دەشکێنێ و دژ بە کردەوەکانی دەوەستێ.

بێگومان فیمینیزمی کوردی بەشێک لە شیعری کوردی ئەم سەردەمەیەو یەکێک لە سەنگەرەکانی ئەمڕۆی شیعریش، بزاڤی ژنانە.

### ٥- شیعرو خەباتی کۆمەلایەتی

---

[2] سایتی «ڤیریتاس ئونیڤێرسالیس»ی دانیمارکیی :
http://universalgeni.wordpress.com/١٣/٠٦/٢٠٠٧/irakisk-kurdistan-٣٠٠٠٠-kvinder-myrdet-de-sidste-١٥-ar/

کورد ئەمڕۆ لانی‌کەم لە بەشێکی هەرچەن بچووکیدا خەریکە ئەزموونی سەربەخۆیی تاقی دەکاتەوە. دیارە ئەم قۆناغەش کۆسپ و هەڵدێرگای فراوانی تێدایەو دوژمنانی سوێندخواردووش مەتەریزی دەسرێژی چۆڵ ناکەن و هەردەم بە تەمان ئەم ساوای نۆرەسە لە لانکەکەیدا بخنکێنن و کولی دڵیان بە خوێنی دامرکێنن. بوون بە دەوڵەتیش بێ کێشەو خوارو بان نابێ؛ لانی‌کەم ئەزموونی چەن‌سەد ساڵەی دەوڵەتە خواپێداوەکان وامان پیشان دەدا.

شیعر ئەم جارەش باشترین رێنوێن و رێنمایە. شیعرە کە بە زێڕی دەسەڵات نافریوێ و رێبازی بەرنادا، نابەرامبەرییە کۆمەڵایەتییەکان داخێکی گرانن بە سەر دڵی شیعردا. شیعر بۆ هێور کردنەوەی ئەم داخە لە هیچ هەوڵێک ناوەستێ و روو لە ئاسۆی گەیشتن بە وڵاتێکی دیموکراتیک باری قورسی کۆمەڵ لە کۆڵ دەنێ و لە رۆیشتن ناوەستێ.

هەریەک لەم چەمکانەی کە بە کورتی باسی لێکرا، جێگای ئەوەی هەیە کە بە درێژایی ژیانی شیعر لە سەریان بڕۆین و هەزاران لاپەڕەی بۆ رەش کەینەوە، بەڵام لە پێشەکیەکدا زۆرتر لەمەی بێژرا نابێژرێ. کەواتە با خوێنەری هێژاو زانا خۆی تێیدا رابمێنێ و لێی ورد بێتەوەو وەردی بداتەوە.

***

بۆ کۆکردنەوەی ئەم شیعرانە، هانمان داوە زۆرتر شیعری ئەو شاعیرانە بێنین کە کاریگەریان بە سەر بزاڤە کوردیەکاندا بووەو دەورێکی بەرچاویان لە پێشبردنی چارەنووسی کورددا هەبووە. هەندێک لە شاعیرەکان رەنگە زۆر لاوتر لەوەی بن کە بە سەر بزاڤی کوردیدا کارگەریان هەبووبێ؛ راستە، بەڵام ئەوانەمان وەک نموونەی شیعری داهاتووی کوردی هێناوەتەوە.

خوێنەری هێژا! هەر نووسراوەیەک بێ‌خوێنەر بمێنێتەوە پووچەڵ دەبێ و وەکوو بەفر لە بەرچاوی خۆر سوێی دێتەوەو دەتوێتەوەو هیچی لێ نامێنێ. ئەو بیرەی دەبێتە وشەو خۆی دەنووسێنێ بە سەر سینگی لاپەڕەکاندا، هیوای ئەوەیە بڕواتە

پێش چاوی بیریکی‌تر و پێک بگەن و ببنە یەک. بە چاوی رێزەوە سەیری بکرێ و ئەگەر بۆ چەن ساتێکیش بووبێ، بنرێتە سەر مێزی خوێندن و چاوی پێدا بخشێنرێ.

ئەم کتێبەی بەر دەستیشتان لەم بنەمایە بەری نییەو هەمان ئاواتی هەیە. ئاواتی ئەوەیە ئەگەر رەش و رووتەو نوقسانی هەیە، بە چاوی لێبوردنەوە سەیری بکرێ و وەک پەرتووکێک بتوانێ لە نێو کتێبخانەی کوردیدا جێگای خۆی بکاتەوە.

زۆر سپاسی ئەو دۆستانەم دەکەم کە بۆ ئەم کارە یارمەتییان دام کە بێ یارمەتی ئەوان، ئاواتی بە دیهێنانی ئەم بەرهەمە وەکوو منداڵێک لە پزدانی دایکیدا دەمایەوەو قەد چاوی بە سەر دونیای رووندا نەدەکردەوە، بە تایبەت زۆ سپاسی براو دۆستی هێژام کاک رەئووفی مەلایی دەکەم کە بێ یارمەتی ئەو، ئەم کارەم قەد بەرگی کتێبی نەدەپۆشی؛ هەروەها سپاسی دۆست‌و هاورێم ئەفشینی بەهاری‌زەڕ دەکەم کە پێشنیارەکانی بۆ بەدەوتر کردنی کتێبەکە، زۆر بەجێ بوو.

فەخرەدین ئامێدیان
١٣٨٧/٢/٢ سنە

عەبدوڵلابەگی گۆران کوڕی سلێمان-بەگ لە ساڵی ١٩٠٤لە شاری هەڵەبجە لە دایک بووەو هەر لەوێ نراوەتە بەر خوێندن. لە ١٩١٠دا بابی بە رەحمەتی خودا دەچێو ناچار دەگەڵ تاقمێ لە خزمانیدا بنەوبارگەیان بەرەو هەورامان لێکدەنێن. لە ١٩١٢دا دەڕوا بۆ کەرکووک‌و لە مەکتەبی «عیلمییەی» ئەو شارەدا درێژە بە خوێندن دەدا؛ بەڵام پاش چەند مانگ ناچار دەبێ بگەڕێتەوە بۆ لای دایکی.

لە ساڵی ١٩٢٦دا لە ئیدارەیەکدا وەردەگیرێو هەر لەو ساڵەوە ژیانی هونەری خۆی دەست پێدەکا.

لە ١٩٥٨دا لە زانکۆی بەغدا دەبێتە ماموستای زمان و ئەدەبێ کوردی، بەڵام ئەجەل ماوەی نەدا بەو چەشنەی کە خۆی دەیەویست درێژە بە پەروەردە کردنی قوتابی و خزمەت بە زمانی بدات و لە ٢١ دیسامبری ١٩٦٢ ئەم ئەستێرە پرشنگدارەی ئاسمانی ئەدەب و هونەرە رووی لە ئاوا بوون نا.

ماموستا گۆران لە سەرەتاوە لە سەر کێشی عەرووزی شیعری دەگوت، بەڵام دوایی کە هەستی کرد شیعری عەرووزی لە دەورانی نوێدا بۆ دەربڕینی هەست‌و بڕینی ڕێگای پڕ لە هەورازی خەباتی کۆمەڵایەتی کزو کۆڵەوارە، ئاوڕی دایەوە لای شیعری خۆماڵی کوردی‌و شۆڕشێکی لە شیعری کوردیدا

بەرپا کرد کە چارەنووسی شیعری کوردی بە تەواوی گۆڕاو ڕێبازێکی نوێ لە شیعری کوردیدا بەرپا بوو.

## دیاری خوای شەڕ

دیاری خوای شەڕ، خەشمە و قینە
دوشمنیە و ڕقە و کینە،
بەدخواهییە و نیهادی پیس
باری لێکدانەوەی ئیبلیس
دیاری خوای شەڕ، پڕ بە دڵ ترس
یەکزمان و سەد هەزار پرس،
گومان لە ڕاست، بەڵام باوەڕ
بە درۆ-ئاخ دیاری خوای شەڕ!-
دیاری خوای شەڕ ڕەنجە و ئازار،
مەرگی لەشکر، وێرانی شار،
بۆ دایک: تاقانە کوشتن،
بۆ کۆرپەی ناز: هەتیو خستن!
خوای شەڕ ئینسان لە هاوجینسی
ئەکا بە گورگێکی برسی،
ئاگر، قورقوشم، غازی خنکێن
ئەداتە دەستی و پڕ لە جوێن
ئەکا دەمی و پێی ئەڵێ: عەرش!
بۆ بن دەریای تاریک و ڕەش،
بۆ ناو هەور و برووسکەی بەرز،
بۆ جێی دوور دوور لەسەر رووی عەرز
عەرش! وەک دڕندە، وەک هار عەرش!
دنیا ڕەنگ کە بە خوێنی گەش!
پەلامار دە، دەست و برد کە

بگرە، ببڕە، بدڕە، ورد کە
قەلا، تەلبەن، شوورا، سەنگەر،
حەیوان، ئینسان، شاری، عەسکەر،
ژن، پیاو، پیر، جوان، دەست، قاچ، سنگ، سەر
پاشێل کە هەرچیت دێتە بەر
بێ سووچ بکوژە، سەربەست دیل کە،
دەرگای مێشک و دەم کلیل کە،
کۆمەڵ برسی، ولات لات کە،
نەخۆشی زۆر، دەرمان قات کە،
قوتابخانە، بیمارستان،
کۆگای فەن کردی کۆن و جوان،
شوێنی بە کەلک گشت خاپور کە،
بنچینە و بان، خوار و ژوورکە!
دەزگای شارستانی تێک دە
ئەمڕۆ رۆژی مەحشەر لێک دە

**یار** ........................................................................................................................

یار، یار!
شیرین لەنجە و لار
چاوم ڕوا
سەبرم سوا،
هێزم لێ بڕا،
هەر نەهاتی، دەرنەکەوتی،
بۆچی تو خوا؟
یار، یار، شیرین لەنجە و لار!

***

ژماردم گشت ئەستێرەی شەو،
تاقتاقکەرەم کردە خەو،
لەبەر کزەی بای سارد تەزیم،
لەگەڵ گەڵای درەخت لەرزیم،
ئاونگ وەک گیا تەڕی کردم،
هەر نەهاتی، ئەوا مردم
چاوەڕوانم،
پەرێشانم،
پەرۆشە گیانم
سا بمگەڕێ هێزی ژیانم
یار، یار، شیرین لەنجە و لار!

***

نیگام تینووی تەماشاتە
دادووراوی سەر ڕێگاتە،
گوێم عەزرەتی ترپەی پێتە،
هەمیشە ئاراستەی ڕێتە،
دڵم پڕ تاسە و پەرۆشە،
دۆزەخێکە و گەرمی جۆشە
یار، یار،
دەرمانی ئازار!

**تاسەی دیدار** ..........................................................................................

«بەزمان دایکی کوردستانەوە بۆ برا فەیلییەکان»

رۆڵەی ۱ووری ئاوارە بووم

کەللەی پڕ بوو لە ئارەزووم
سەودای سەری، تاسەی دڵی
خۆزگەو ئاواتی بە کوڵی
هەر ئەوە بوو: کە باڵ بگرێ
وەک مەل، تا باوەشم بفڕێ
دەم بنێتە دەمی کانیم،
دەست بکاتە ملی لووتکەم،
گوێچکە شل کا بۆ گۆرانی،
بۆم پێکەنێ وەک خوڕەی چەم
بەڵام ساڵان
ساڵانی زوو
کوندەبەبوو
کوندەبەبووی شووم ئەیقڕان
قەدەغە بوو لە منداڵان
بۆ گۆی مەمک بەرن دەمیان،
قەدەغە بوو دەستی دایک
بنێتە دەم ساوا مەمک
سەردەمێک بوو،
کوندەبەبوو،
قەل ئەیقڕان،
گورگ ئەیلووران
پڵنگی دوو پێی دارستان
شارستانیەتی ئەلەرزان
ڕۆژ تاریک بوو، ڕێگا ترس بوو،

«جووله» پەلپی هەزار پرس بوو
رۆلەی دووری دەشت نشینم
ئەبوو، هەرگیز، تێر نەبینم!
رۆلەم لەگەل رۆلەی دیجلە،
لەگەل رۆلەی دیجلە و فورات:
لە خوێناوێ ئەیکرد مەلە،
بە خوێنی جەرگ ئەیکرد قنیات!
رۆلەم دیل بوو،
دیل زەلیل بوو،
شەو بێخەو بوو،
پۆلیس وا بەسەریا زال بوو
وەک کۆتر نێچیری دال بوو
سەرەرای هاودەردی دیجلە
ترس هەبوو، شەق و زللە
وشەی کوردی سەر زمانی
باتە قەلەم بە تاوانی
بەلام رۆلەی من و فورات
رۆژی پیرۆزیان لێ هەلهات،
چواردەی تەمووز پچڕ زنجیر:
لەسەر مل لاچوو دەمی شیر،
پرشنگی رۆژی ئازادی
وێرانەی پڕ کرد لە شادی
بای فێنکی زەردەخەنە
بەسەر کولما کەوتە شنە

چاو وەکوو گوڵ مەستی ڕەنگ بوو
زمان بەستەی خەستی دەنگ بوو
کوڕ کۆشی دایکی کەوتە بیر
دایک مەمکی پڕ بوو لە شیر
ئەوا ئێستا خوشک و برا،
براو برا
لە یەکتری بوون ئاشکرا.
هەر دەستە هەر دەستە گوشرا
تینوو- تینوو! لە مل کرا
هەر ڕۆڵەی دوور کوردستانە
لە کۆشی دایکا میوانە

سلێمانی. ئابی ١٩٥٨

## بێشکەی منال

دایک دای ڕەنج، بۆ منال دای
بۆ بزەی ناو بێشکەی ئارام،
بۆ شیرینی گڕ و گاڵ دای
باوک هەچ ئارەقێکی ڕشت
بۆ ئەوەی ڕشت —من دڵنیام-
نەمری کات: بڕبڕەی پشت
ئای ئەو ماڵە چەن ئاوایە
کە دایک و باوک لای بێشکەدا
گوێیان لە مشەی ساوایە
ئای ئەو ماڵە چەن بێباکە
کە لە بارووت و لە بۆمبا

ژێر بێشکەی منالیان پاکە
ئای چەن خۆشە: مالێک بێ وا
رووی دنیا، ئەمپەڕ تا ئەوپەڕ
دلنیا بین بێشکەی ساوا
نابێ بە خۆلەمێشی شەڕ

بەرقیخە ١٩٦٢/٦/١٢

**بەری بەیانە** ..........

بەری بەیانە، ڕووناکە ئاسۆ
ئاسۆی هیوای کورد، مژدە بێ لە تۆ
دەنگی بانگ هەلسا لە مزگەوتی دێ
بالدار هێلانەی خەو بە جێ دێلێ،
قاسپە قاسپی کەو ئاشکرا ئەلێ:
کاتی فرمان هات، کورد نابێ بنوێ
بەری بەیانە، ڕووناکە ئاسۆ
ئاسۆی هیوای کورد، مژدە بێ لە تۆ
هەلسە ئەی لاوی نیشتمانی کورد
سەردەمی هەلسان هەرکەسێ نووست، مرد
پێویستی پیرۆز، بەلام سەخت و ورد
چاوەڕوانتە، هەلسە دەستوبرد
بەری بەیانە، ڕووناکە ئاسۆ
ئاسۆی هیوای کورد، مژدە بێ لە تۆ
بۆ بەختیاری و سەربەخۆیی گەل،
لەگەل هاورێتا پەل بدەرە پەل
کەی دەرچوو تیشکی هەتاو لە دەم کەل،

وریا بی، زۆر چاک بە کاربێنی هەل
بەری بەیانە، ڕووناکە ئاسۆ
ئاسۆی هیوای کورد، مژدە بێ لە تۆ

## تیروکەوان

«پێشکەشە بۆ کۆنگرێسی ئاشتی و چەک فڕێدانی گشتی لە مۆسکۆ، مانگی تەمووز ٩-١٤/سالی ١٩٦٢»

ئەو ئاسمانە شینەی ژوور سەر
کۆتری سپیی تیا خول ئەدا
بە بێ خەتەر
لەو ئاسمانە
گڕی سپی ئەو بالانە
ئاوێنەی ئارامی ژینە
کۆشی وەنەوزی شیرینە
ڕوونی ئەخاتە شەبەقمان
سێبەر ئەکا بۆ ئارەقمان
بەری ڕەنجی تالمان بە لێو
ئەکا بە هەنگینی بایێ مێو
ئەگەر مەلی ئاسمانی شین
بالی بەیاخ نەبێ بۆ ژین،
لە هیچ باغچە و بەهارێکا
لە جێی دڕک گول نابینین،
گول نابینین!
ئەو تاوانبارەی بۆ کۆتر
لە ژێی کەوان تیر گیر ئەکا

پارچەی جەرگی ناو پشکەی خۆی
پێش هینی من نێچیر ئەکا!
لەگەڵ ئەوەش دەستی چەپەڵ،
ئابڕوو تکاو،
هەر خەریکە، تەکەڵ تەکەڵ
بۆ ئاسمانی پڕ لە هەتاو
تەپە دووکەڵ هەڵئەستێنێ
گڕی سپی ئەخنکێنێ
پیاوخۆرێک وا
بە گۆشتی رۆڵەی خۆی چەش بێ
رۆژهەڵات بۆی، وەک رۆژئاوا
دەبۆی تیر بێ، هی تەرکەش بێ
دیارە هەرگیز لە پەلامار
واز ناهێنێ وەک گورگی هار!
با هەزار جار،
گیرفانم پڕ لە بەڵێن کا
جووت بەقیی بەڵێن بە سوێن کا
کە هەڵئەگرێ
دەست لە گەزەن هەتا ئەمرێ
من تەجرەبەی پار و پیرار
نایەڵێ چاو بێ ترس لێک نێم،
لە گازی مار
ئەگەر دنیا ئاشتی ئەوێ،
بۆ ژێر سەری خەوی ئارام

له تووکی قوو پشتی ئەویٚ
راویژ هەر ئەوەیە لەلام:
هەتا زووە،
تا خەلک گشت بە قڕ نەچووە،
دان لە دەمی مار دەربێنیٚ
چەک نەمێنیٚ
ئەوسا، بیٚ ترس، تیر ئەنویٚ چاو،
ئەچێنە ئیش دوو دەستی پیاو!
ئەوسا باخچەی ژیانی نویٚ
جوانترین گوڵ تیا ئەپشکویٚ
ئەوسا ئینسان،
بەدەستی بیٚ تیر و کەوان،
زووتر تووی گوڵی زەوی
بۆ ئەبریٚ تا ئەستێرەکان

بەرقیخە ١٩٦٢/٦/١٧

**نەورۆزی ٦١**

وەنەوشەی بن دڕک خزاو
چاوی رەشی کردەوە، دی
نێرگسەجاریش بە هەزار چاو
پێئەکەنیٚ: زەرد و سپی
نێرگسی بەر هەتاوی گەرم
مژدەی پیٚ بوو بۆ وەنەوشە،
وتی: خۆشکیٚ
خوشکی جوانی چاو پڕ لە شەرم

خڕ داخراو دەرگای حەوشە
فرمێسک لە چاوت بۆ ئەتکێ؟
وا بەهارە
لەسەر لووتکەی سپی دیارە
ورشە و پرشەی یاقووتی ئاڵ
گڕی جەژنی سەرەتای ساڵ.
وەنەوشەی چاو رەشی شەرمن
دەستی کرد بە بەستە وتن
بێ سڵ کردن
لە نووکی خەنجەری دوژمن
خۆی هاویشتە باوەش چەپکێ
گوڵی وەنەوشەی ناو دڕک
کە گەیشتە دەستی تاسەم
پڕ لە بۆنی بوو هەناسەم
عەتری چپەی تکاندە گوێم
مژدەی: «هات... نەورۆزا!»ی داپێم

***

ئەی ئەو جەژنەی هاتیت و چوو
لە دەم تاڵی پاری مردوو
ئەی ئەو جەژنەی هەزاران ساڵ
لە رابوردووی کوردی زۆر تاڵ
تاقە بزەی یادگاریان
هەر تۆ بووی، جەژن و بەهاریان
لە خەمی کۆن، ئازاری کۆن

زووخاوی دەست زورداری کۆن
یەکی سالی تر دوورت خستین
لەولاشەوە، جەژنی شیرین
بە هاتنت یەک سالی دەق
کاروان پێشکەوت بەرەو شەبەق
واتا: ریگا ببرین بە دەو،
سالێک زووتر دوایی دێ شەو،
ئەو شەوەی مەشخەلی گەلان،
ئاگری بەر ئەدا لە گیان
لە هەر چوار لای جیهانەوە
تا بە دەم بای سووتانەوە،
تۆزی لە رووی پەڕەی مێژوو
ئەنیشێ وەک خاکەی رێژوو
ئەوسا، نەورۆز
جەژنی پیرۆز
دڕک ئەڕزێ و داخی دلی
ئەبێ بە بۆگەن بۆ گلی
تۆیش ئاهەنگی بەهارەکەت
نەخشی لووتکە و نزارەکەت
لە باخچەی گولی گەلانا
گولێک ئەبێ لە مەیدانا...
هەر مرۆڤێ دی و بۆنی کرد
ئەلێ: بژی نەورۆزی کورد!

بەغدا، مارتی ١٩٦١

# هێمن موکریانی

محەمەدئەمین شێخولئیسلامی موکری ناسراو بە هێمن موکریانی، ساڵی ١٩٢١ لە گوندی شیلاناوێ سەر بە شاری مەهاباد، لە دایک بووە. ساڵی ١٩٤٢ پاش تەواو کردنی خوێندن لە خانەقای شێخی بورهان لە شەرەفکەند، دەگەڵ دۆست و هاوڕێ و یاری مەکتەب و سەنگەری، مام هەژاری موکریانی دەبنە ئەندامی کۆمەڵەی ژ.ک(ژیانەوەی کورد).

ساڵی ١٩٤٦ لە کۆماری مەهابادا نازناوی شاعیری نەتەوەییان پێ دەدرێ.

پاش تێکچوونی کۆمار ژیانی ئاوارەیی و دەربەدەری هێمن دەست پێدەکات و ئیتر تا ژیا، ژیان رووی خۆشی پێ نیشان نەدا.

ساڵی ١٩٧٠ لە بەغدا دەبێتە ئەندامی کارای کۆڕی زانیاری کورد. ساڵی ١٩٧٩ دەڕواتە ریزی پێشمەرگەکانی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێرانەوە. پاش گەڕانەوەی بۆ ئێران دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی سەلاحەدینی ئەیووبی لە ورمێ دادەمەزرێنێ و ئەو دەزگایەو کۆڤاری سروە – کە ساڵی ١٩٨٥ دایدەمەزرێنێ – دەبنە بنکەو قوتابخانەیەک بۆ کۆبوونەوەو چالاکی نواندنی هەموو ئەو کوردە رۆشنبیرانەی کە ساڵانی دوایی بوون بە رێبەران و پێشڕەوانی ئەدەبی کوردی.

سالی ١٩٨٦ دەستی جەهاندار جەهانبینی هێمنی بەست و رۆحی پیرۆزی بەرەو دیاری خامۆشان بەرێ کرد. رۆحی شاد.

بەرهەمەکانی:

- تاریک و روون، کۆمەڵە شیعر.
- نالەی جودایی، کۆمەڵە شیعر.
- پاشەرۆک، کۆمەڵە وتار.
- چەپکێک گوڵ و چەپکێک نێرگز.
- توحفەی موزەففەرییە، کۆکردنەوەی ئۆسکار مان، ویرایش هێمن موکریانی.

هەروەها چەندان وتار و لێکۆڵینەوەی تر کە لە تەمەنیدا لە رۆژنامەکانی کوردستان، هاواری کورد، هاواری نیشتمان، گڕوگاڵی مندالان، ئاگر، هەلالەو ... بلاوی کردۆتەوە.

**ئێوارەی پاییز**

لە ئاسۆیەکی دوورە دەست
ئاوا بوو زەردە پاییزی
دەتگوت بووکێکی بێ نازە
پەردە جێ دێلێ بە زیزی
پەڵە هەورێکی چلکنە
گرتی سووچێکی ئاسمان
گەڵای زەردی دارێک وەری
زریان بردی بەرەو نەمان
جووتێک کۆتری سەر بە کلاوە
هەڵکوور ماون لە سوانەیەک
دیارە لەو دەوروبەرانە
پێیان شک دێ هێلانەیەک
پاساری سەر داری کۆڵان
فڕە و جیکەیان لێ بڕا
قەل فڕی فڕی تا ون بوو
هەر رووڕەشی خۆی پێ بڕا
شەپۆلێک مۆسیقای بەسۆز
هات و رابورد بە بن گوێمدا
شوێنێکی بۆ خۆی کردەوە
لە ناخی دڵی توێ توێمدا

ئاخر کۆڵی بۆ بردە ژوور
باربەرێکی درێژی رووت

دەرکی دووکانی گاڵە دا
مام حاجی و بەرەو ماڵ بزووت

نازدارێکی چارشێو بەسەر
بە تەنیشتمدا تێپەڕی
بە غار هات و توند قیژاندی
رووتەڵەیەک بە بەدفەڕی

کەمێک راوەستا جا رابورد
ئەو لاوەی جادەی دەپێوا
دیار بوو خێسێکی دابوویە
ئەو شۆخە لە بن چارشێوا

کیژێک خۆی لە ژوور کوتاوە
دەرکەی حەوشەکەی پێوەدا
ئیتر شوێنەواری جوانی
بەدی ناکەم لەم نێوەدا
تا تاریکان پەیدا دەبێ
چۆڵ و چۆڵتر دەبێ جادە
نە دێتە دەر کیژی لەبار
نە رادەبرێ لاوی سادە
هەوا بوولێڵە، ئاو لێڵە
گوڵ سیس بووە، گەڵا زەردە
تەنانەت رەنگی گۆڕاوە

ئەم دیوار و دار و بەردە
تەماشای هەر شتێ دەکەم
ڕەنگی پاییزی گرتووە
جوانی خۆی لێ شاردوومەوە
دزیوی ریزی گرتووە
چاوم لە ئاسمان بڕی
دڵم هێندەی دیکە گیرا
گەلێک بیرەوەری کۆنم
لەپڕ هاتنەوە بە بیرا
ئارام ـ ئارام بە لۆژەلۆژ
ئەوا بەرەو ماڵ بوومەوە
نە کەس لە پێشمدا دەڕوا
نە کەس دیارە بە دوومەوە
نا نا ناڕۆم، مەلەی دەکەم
لە نێو دەریای مەندی خەیاڵ
داهێزاو و رووگرژ، تووڕە
دڵ پڕ تاسە، مێشک بەتاڵ
ئاخ! دیسان رووپەڕێک دڕا
لە ڕۆژئەژمێری تەمەنم
ئاخ! دیسان شەو داهاتەوە
من هەروا دوورە وەتەنم
ئاخ! دیسان چوومە ژێر باڵی
ڕەشی شەوگاری تەنیایی
ئاخ! دەبێ دیسان بچێژم

ژەهراوی تاڵی جودایی
ئاخ! دیسان دەبێ رابوێرم
لە ژوورێکی سارد و سڕدا
دەگەڵ ئازار دەستەملان بم
تا بەیان لە نوێنی شڕدا
دەڕۆم، دەترسم، دەلەرزم
لە پەلاماری مۆتەی شەو
داد لە دەس ئەم دڵەی بە خەم
وای لە دەس ئەم چاوەی بێخەو
دەڕۆم تا سەر پێکەوە نێم
دەگەڵ زام و دەرد و ئێشم
دەڕۆم تا شەوێکی پاییز
من شەونخوونی بکێشم

لە دوور قاقایەکم گوێ لێ بوو
دەتگوت گوڵلەم پێوە دەنێ
چۆن بە ئێوارەی پاییزیش
ئی وا هەیە پێبکەنێ؟
خەیاڵم ببوو بە وشە
نەمزانی کەس بە دوامەوە
دەنگێکی لەرزۆک و نەرم
بەسپایی جوابی دامەوە:
بەڵێ هەن و یەکجار زۆرن
بازرگانی فرمێسک و خوێن

بەڵێ هەن و پێدەکەنن
بە سەربەهەش، بە ملبەکوێن
بەڵێ هەن و پێدەکەنن
بە من، بە تۆ، بە هەزاران
بە داخی باوک کوژراوان
بە هەنیسکی هەتیوباران
بە نەزانی، بە نەخۆشی
بە تاریکان، بە شەوەزەنگ
بە زنجیر، بە تەناف، بە دار
بە گرتووخانەی تەڕ و تەنگ
بە بۆکوڕووز، بە چرە دووکەڵ
بە هالاو، بە گڕ، بە ئاگر
بە تەم، بە مژ، بە هوڕە، بە دۆک
بە تۆفانی وڵات داگر
بە بووەلەرزە، بە ڕەشەبا
بە سووتمان و زریان و زەڕ
بە هەرچی خراپ و شوومە
بە گشت دەسکردی خوای شەڕ
بە ناڵە، بە کوڵ، بە گریان
بە سینگ کوتان، بە ڕوو ڕنین
بە بەرگی ڕەش، بە چاوی سوور
بە گۆڕخانە، بە کۆڕی شین
بە کەلاوە، بە کوندەبوو
بە دیواری هەرەس هێنار

به داوێنی تیتۆڵ تیتۆڵ
به ئانیشکی پینه‌کراو

***

به نووکه‌نووکی بێوه‌ژن
به هانه‌هانی ماندوان
به زیره‌زیری منداڵان
به نووزه‌ی نیوه زیندوان
به نه‌ڕه‌نه‌ڕی جه‌للادان
به قرمه‌قرمی شه‌ستیران
به ویره‌ویری قه‌مچیان
به ئه‌شکه‌نجه‌ی رووناکبیران
به چڵکی یه‌خه‌ی کرێکار
به که‌فی سه‌رشانی جووتێر
به په‌چه و رووبه‌ند، به خه‌نجه‌ر
به یه‌ک نه‌بوونی مێ و نێر

***

به قه‌ڵه‌می به‌زیوی کول
به زمانی له بندا بڕاو
به ده‌رکی داخراوی فێرگه
به کتێب و ده‌فته‌ری دڕاو

***

له قامووسی ئه‌وانه‌دا
به‌زه‌یی مانای نه‌ماوه
بێزیان له بزه هه‌ڵده‌ستێ

وازیان لە خوێن و زووخاوە
هەر دڵۆپی خوێنی لاوێ
بۆ وان یاقووتێکی سوورە
هەر تکەی فرمێسکی کیژێ
بۆ وان مرواری بەرموورە
هەناسەی ساردی ئاواران
کۆشکی ئەوان گەرم دەکا
لەشی رەق و زگی برسی
جا پاروویان نەرم دەکا
سەرمایەی وان لە گەڕدا بێ
با زۆر دەرک بە قوڕ گیرێ
دۆلار لە برەو نەکەوێ
با کۆڵەوار بێ داپیرێ
دەبێ خوێن بێ و سەران بەرێ
چەرخی کارگەیان بگەڕێ
پێدەکەنن، پێدەکەنن
بە بڵێسەی ئاگری شەڕ

***

گوتم کەوابوو ئاشنا
بەشی ئێمە لەنێو چوونە
گوتی: «نا، نا، دوور بنوارە...
دوور بنوارە... ئاسۆ روونە...»

١٩٧٤

# جگەرخوێن

ناوی «شێخ موس مەلا حەسەن»ە. ساڵی ۱۹۰۳ لە گوندی «هەسار» سەر بە ناوچەی ماردین لە بنەماڵەیەکی هەژار و دەستکورت دێتە نێو دونیای پڕجەخارەوە.
هێشتا تەواو چاو ناکاتەوە کە بابی بە ڕەحمەتی خودێ دەچێ و ئەرکی ماڵ و منداڵ دەکەوێتە سەر شانی و ناچار دەبێتە شوان و ڕەنجبەری ئاغاو دەوڵەمەندان.

لە بەر نەداری بۆی نالوێ بڕواتە قوتابخانە، بۆیە لە ۱۸ ساڵاندا دەڕواتە حوجرەی مەلا و خوێندنی ئایینی دەست پێدەکا.
ڤیانی گەل و ولات هەموو گیانی دەتەنێتەوەو ناهێڵێ تەنیا لە بەندی وانەی مەکتەبدا بێ و خوێندنی بەرهەمەکانی جزیری و خانی و فەقێ تەیران و... دەست پێدەکات. پاش خوێندنی ئایینی لە گوندێکی کوردستان دەبێتە مەلاو بۆ ماوەیەک ژیانی بە ئاسوودەیی دەڕواتە سەرو لەو فەترەیەدا دەتوانێ زۆرتر خەریکی خوێندنی بەرهەمی کوردی بێ و هەروەها گەرای ئەڤینی گەل و ولات دەڕژێنێتە ناخی دڵی خەڵکی گوندەکەوە.

پاش شکانی شۆڕشەکەی شێخ سەعیدی پیران لە گەڵ ڕۆشنبیرانی تردا ئاوارەی سووریا دەبن و ساڵی ١٩٢٧ لە سووریا کۆمەڵەی «خۆیبوون» دادەمەزرێ کە جگەرخوین یەکێک دەبێ لە دامەزرێنەرانی ئەو کۆمەڵەیەو لە هەمان کاتدا کۆڤاری «هاوار» دەردەکەن و شێخ موس لەو کۆڤارەدا شیعرەکانی لە ژێرناوی «جگەرخوین»دا بلاو دەکاتەوە.

لە ١٩٥٠دا پاش دامەزراندنی پارتی دیموکراتی کوردستانی سووریا دەبێتە ئەندامی ئەو پارتە. لە ١٩٥٨دا دێت بۆ کوردستانی عیراق و دەبێتە ماموستای زمان و ئەدەبی کوردی لە کولیژی زمانی زانکۆی بەغدا.

لە ١٩٦١دا دەڕواتە ریزی خەباتگێرانی شۆڕشی مەزنی ئەیلوولەوە. پاش ١٩٧٠ دەگەڕێتەوە سووریاو تا ١٩٧٩ ژیانی دەکەوێتە بەر زیندان و ئەشکەنجەو ئازاری حکوومەتی بەعسی سووریا.

لە ١٩٧٩دا دەبێتە پەنابەری ولاتی سویدو تا ١٩٨٤/١١/٢٢ کە دڵە ئەویندارەکەی گەل و ولاتی لە لێدان دەوەستێ هەر لەوێ دەژی. پاشان جەستە ماندووەکەیان بە فڕۆکە گواستەوە بۆ کوردستانی سووریاو لەوێ ناشتیان.

## نازکا من هاتە خوارێ

نازکا من هاتە خوارێ
دایە هندور شەوق و تاف
خانی داگرتێ ژ بینێ
نێرگز و مسک و گولاف
بوو بهەشت و مێرگ و گولشەن
چیچەک و گول پشکڤین
باغێ شەهبالێ پەری بوو
پادیشاهم ئەز دناف
دامە دەستێ گەورو نازک
کوو ب گەرمی من گڤاشت
هەر دوو چاڤان تیر رەشاندن
سۆرە لێڤان کر سلاف
من دبەر سینگا خوەدا
ئانی سەری بەردایە سەر
ئەز ب چاڤان لێدنێرم
بەژن و بالا پر زراف
سحرەبازن هەردو چاڤێن
رەشبەلەک ئاور ڤەدان
روو وەکی بەرفا زناران
بسک لە هاویر بوونە داف
لێ چەن و لێڤ و کەپوو
ئەلماس و لال و گەوهەرن
سێڤ د سنگێدە بلندن

نووگهانە گەورو خاف
کەتمە گومانێن دکوور
پێلان لە من دابوون لە هی
خوەش دبەر پێلان دچم
لێ کێ دزانێ، ئاف و ئاف
من ژ لێڤان شەربەتا
سێوان ڤەخواری دەف بە دەف
زولف و بسکێن مسک وتاری
لێ شکەستی هەر دوو چاف
هەورێ گومانان بەلاف بوو
ترس و ساوێر قەت نەمان
یار ب چاڤێن رەشبەلەک
ئەز زوو گهاندم بەر دەلاف
ئەز گهام بەر ئاف و دەشتێ
کەتمە نێڤ باغێ بهەشت
ئۆخ ل جانێ من چ خوەش تێ
دێ چکەم زێرو دراف؟
بەخچەیێ میرێ جنایە
دل بترس ئەز پێدەچووم
وێ، ل من دەرگەهـ ڤەکر
ما وێ چ بێژن دێ و باف؟
گو جگەرخوین بۆچ مەستی
دل بترس و شەپرزە؟
ما گەلۆ وێ بێنە دەستێ

مە هەرۆ ئەڤ پێل و گاڤ

**کیمە ئەز**

کیمە ئەز؟
کوردێ کوردستان
تەڤ شۆرش و ڤولکان
تەڤ دینامێتم
ئاگرو پێتم
سۆرم وەک ئێتوون
ئاگرگها قەپسوون
گاڤا بتەقم
دنیا دهەژێ
ئەڤ پێت و ئاگر
دژمن دکوژێ
کیمە ئەز...؟
ئەزم رۆژهەلات
تەڤ برج و کەلات
تەڤ باژارو گوند
تەڤ زنار ولات
ژ دەستێ دژمن
دژمنێ خوێنخوار
ژ رۆم، ژ فرەنگ
د رۆژێن پر تەنگ
بکوشتن و جەنگ
پاراست، پاراست

پاراست من ئەڤ رۆژهەلات
کیمە ئەز...؟
رۆژهەلاتێ نێزیک
رۆژهەلاتێ ناڤێ
ئەڤ بازار و گوند
ئەڤ بەژو ئاڤی
کەت بن دەستی من
پێ دا سەر دۆژمن
من بجەنگ و شەر
زانین و هنەر
پشتا وی شکاند
سەری لێ گەراند
ئەز بووم پادیشاه
خورت و سەربلند
کەتن دەستێ من تا سنۆرێ هند
کیمە ئەز...؟
کیمە ئەز...؟
کوردێ سەرفراز
دژمنێ دژمن
دۆستێ ئاشتیخواز
ئەز خوەش مرۆڤم
نە هرچ و هۆڤم
لێ چپکەم بێ شەر
دژمن ناچێ دەر

باف و کالێن من
دژین تەڤ سەربەست
ناخوازیم بژیم
تا ئەبەد بن دەست
کیمە ئەز...؟
...
...
کیمە ئەز...؟
ئەزم ئەڤ مللەت، ئەزم ئەژدەها
ژ خەوا دیلی شیار بووم نها
دخوازم وەک مێر
دخوازم وەک شێر
سەرێ خوە هلدم
چ سەر بلندم
بجیهان جارەک
ئەز بدم زانین
رێچکا مارکس
رێچکا لەنین
کورێ گوهدەرزو فەرهاد و روستەم
کورێ سالارو شێرگوهـ و دەیسەم
بەژن بلندم
وەک دێو بلندم
ئەز دەست درێژم
سەربەست دبێژم

دخوازم بلەز
گاڤان باڤێژم
کیمە ئەز...؟
نەخوینخوارم ئەز، ئاشتیخوازم ئەز
سەرداریّ مەیە گەرناس و نەبەز
ئەم شەر ناخوازن
دڤێن وەکهەڤی
ئەم پاشڤە ناچن
دژمن درەڤی
ژ بۆ مرۆڤام ئەم تەڤ دۆست و یار
بژی کوردستان بمریّ کۆلەدار
کیمە ئەز...؟

محەمەد سالح کوڕی مەلا ئەحمەدی دیلان، کوڕی مەلا سالح، کوڕی مەلا قادری شەوخوێن. ساڵی ١٩٢٧ لە شاری سولەیمانی هاتوتە دونیاوە. لە مزگەتان و بە فەقێتی خوێندوویە.

لە ١٩٤٨ەوە ژیانی ئەدەبی خۆی دەست پێدەکا. بێگومان ماموستا دیلان لە یەکەمین دارێژەرانی شێوازی نوێی شیعری کوردییەو کاریگەری زۆری بە سەر دوارۆژی شیعری کوردیدا هەبووە. هەروەها بە هۆی ئەو هەستە ئاشتیخوازانەی کە گیانی هێنابووە کوڵ و خوازیاری ژیانی ئازاد و بەختەوەر — نەک هەر بۆ کورد- بۆ هەموو نەتەوەکان بوو، دەیان جار قولبەست دەکرێ و راپێچی زیندان دەکرێ. چەن جار بە هۆی خۆ پیشاندان دژ بە هێرشی ئیسرائیل بۆ سەر خاکی فەلەستین قولبەست دەکرێ.

بە گشتی ماموستا دیلان ژیانی نەک بۆ شیعر کە شیعری بۆ پەرای ژیان و خەبات دژ بە چەوسێنەران دەزانی.

## نەورۆز

ئاورێ، ئاورێکی دوور
لە رۆژێ، رۆژێکی سوور
ئاورێ لە رۆژێکی سوور
لە تەختێ هەڵگەڕایەوە
لە کارێ دەنگی دایەوە
لە گەلێ چۆن ژیایەوە
ئاورێ، لە قیامەتێ
لە یادێ، یادی میللەتێ
کە راپەڕێ لە خەو
بەرامبەر سامی شەو
بۆ گزنگی رۆژێکی نەر
ئاورێ، بێتە عیبرەتێ
بۆ زاڵمێ، دارێ، پەتێ
یا بۆ وەچەی زوحاک
هێتلەر و چار و ماک
بۆ کۆشکێ بوو بە خاک
ئاورێ لە چەکوش بە شان
لە گۆڕێ، گۆڕی قارەمان
ئاورێ لە چەکوش بە شان
لە کاوەی قارەمان
کە سنگی کردەوە
گەلی لە پشتەوە
گرەوی بردەوە

**نێرگس**

ئەی پرچ پەڕەی سپی و نەرم
رووومەت بلوور
چاو سەرچاوەی مەستی و شەرم
بریسکەی دا
وەک کۆمەڵە ئاڵتوونێکی
زاخاودراو
دەمی زەردت
ئەڕوانێتە بریقەی بەرد
لە قەد پاڵ و گردۆلکە و هەرد
تۆ پرسیارت لە بای وەشتە
کاتێ گۆپکە
لێوی گرژی ئەبزوێنێ
کاتێ چرۆ
چاوی نووستووی ئەتروکێنێ
یا ئەرخەوان
خونچە لێوی ئەنەخشێنێ
تۆ پرسیارت لە بای وەشتە
کەی ئەفڕێ
پەپوولەی وێڵی ئەو دەشتە؟
کەی ئەگاتە
بەهەشتی مێرگ؟
وەڵامی نییە
هەرچی هەیە

وەک تەمەنی گولالەی سوور
تیژ دیێت و گورج تێئەپەڕێ
یا وەک بەفرێکی ساڵ درەنگ
کە بباریێ
چۆن ناگاتە دەم ئێواریێ
ئا بەو جۆرە
با، چرۆ، لەگەڵ گۆپکەی دار
دێن و ئەڕۆن
بە فرمێسکی ئاورنگی شەو
لاشەی لە ناو چوونیان ئەشۆن
ئەی سۆراخی پەپوولەی وێڵ
وەڵام نییە
ناچار ڕوو ئەکەنە یەکتر
ئەی پرچ سپی چاو پڕشەرم
دەم هەر وەکوو گەنجینەی زێڕ
بە دەم شنەی شەماڵەوە
تا ئاژەڵ دێتەماڵەوە
مل بۆ یەکتر ئەلەقێنن
وەکوو دوو پیری ساڵ خوردە
دوو ریشی سپی سەرگۆنا زەرد
رابردوویان
ئەهێنن و بە بای ئەدەن
ئا بەو رەنگە
گوێ بۆ یەکتر رایەڵ ئەکەن

تا زەردە سەر کێوان ئەبەن
کەچی وەلام
یا سۆراخی پەپوولەی وێڵ
ناگاتە گوێچکەی بەق و چێڵ
لە پڕ هەور ئەگرمێنێ
چەخماخەی سوور
دڵی چیا ئەهاژێنێ
تاوی لێزمەی بارانی خوڕ
پەڕەی نەرمت ئەوەرێنێ
چی ناو ئەنێی
هێرش، گریان
هەتاو
زەرکەفتی پرشنگی
ئەنیشێتە سەر رووی زەوی
باڵندە دێتە جم و جووڵ
ئەچریکێنن لەگەڵ نزار
ئەکەونە جۆش و کەف و کوڵ
ئەو نێرگسی ئاواتی کورد
چاوەڕێی «پەپوولەی» «جووڵەی»
پەیام بێنێ
دڵی ئەم کوردە ئازایە راچلەکێنێ؟
ئەوەندەت زانی
سامالی سەرفرازی
هەوری دڕی

به بای هێزی تێکۆشان
سایەقەی ئازادی کڕی

١٩٥٩

## حەسیب قەرەداغی

مانگی مایسی ١٩٢٩ لە گوندی «سۆڵەی چرچەقەڵا»ی سەر بە ناوچەی قەرەداخ لە دایک بووە.

لە منداڵییەوە لە لای باوکی دەخوێنێ و کە قوتابخانە لە گوندەکەیان دەکرێتەوە دەڕواتە مەکتەب و لە پۆلی سێهەمەوە دەست دەکا بە خوێندن.

لە ١٩٤٧ لە دەبێتە قوتابی لە «دارالمعلمین». لە ١٩٤٨دا بە هۆی مانگرتنەوە بە بۆنەی ڕاپەڕینەکەی ١٩٤٨ەوە دەردەکرێ. هەر لەم ساڵەوە (١٩٤٨) ئاوێتەی ڕێکخراوە سیاسییەکان دەبێ و ژیانێکی تازە هەڵدەبژێرێ؛ ژیانێک بە خۆشاردنەوەو هەڵاتن و تا ١٩٥١ دەگەڕێتەوە بۆ زێدەکەی. لە ١٩٥٤دا پاش نەختێ ئەهوەن بوونەوەی بارودۆخی سیاسی ژیانی شارو سیاسەت لە سەر دەگرێتەوە.

تا ١٩٥٨ چەن جار دەخرێتە حەبسەوە. پاش سەرکەوتنەکەی ١٩٥٨ تا ١٩٦٣ خۆی و شیعرەکانی دەبنە سەدرنشینی هەموو بەزمێک و خۆشەویستی هەموو ڕزگاریخوازێک؛ بەڵام پاش کوودەتاکەی ٨ شوباتی ١٩٦٣ قۆڵبەست دەکرێ و دەگەڵ زۆربەی زۆری چالاکان و ڕزگاریخوازاندا تا ١٩٦٥ دەخرێتە حەبسخانە.

ڕەنگە هەر ئەم دوو ساڵە گەورەترین وانەی -چ لە بواری ژیان، چ شیعرەوە- فێری حەسیب کردبێ. لە زینداندا حەسیب لە گەڵ گەورەپیاوانی کورد و

عەرەب ئاشنا دەبێ و شێوازی نوێ لە شیعردا هەڵدەبژێرێ. تا ١٩٦٩ دوور دەخرێتەوە بۆ تاراوگە.

لە ١٩٨٣دا گوڵی ژیانی -کچە گەورەکەی- کە خەمخۆرو داڵدەی باوکە ماندووەکەی دەبێ، هەڵدەوەرێ. ساڵێک دوای ئەویش بەهاری کچی هەر لە بەهاری تەمەنیدا دەستی ئەجەل دڵە بچۆلەکەی لە لێدان دەخاو داخێکی هەرەگەورەتر دەنێتە سەر دڵی برینداری حەسیبەوەو رۆژی روونی لە پێش چاو لێ دەکاتە شەو.

بە کورتی شیعری حەسیب دەنگدانەوەی ئەم کوسپ و چەڵەمانەیە کە بست بستی ژینیان تەنیوەتەوە.

## تینویتی

که تینووت بوو
کانیاوێکی سارد و ڕۆشن هاته ڕێگات
ئەگەر مولکی هەر کەسێک بوو هیچ کۆ مەکە
هەتا تەواو تێراو دەبی
ئۆبالی تۆ بە ئەستۆی من
بێ یەک و دوو بخۆرەوە
لە تینواندا هەر دەمریت
ڕێیان نەدایت
خۆتیان لەگەڵ بگۆڕەوە

١٩٨٦/٤/٩

## نزا

جوانی مەی دێر!
که من دوا چۆڕی پێکی خۆم
کرد بە گڕی ناخی دڵما
نەکەی ئاوی تێ وەربدەی
ئەو پریشکە دەئاڵێتە دەست و سینت
دێیت بەلامدا
نەکەی داوێکی بەربدەی
ئەویان فرمێسکی گەرممە و
وا لە بنی پێکەکەمدا جێی گرتووە
ئەمیان ئاوات و خۆزگەمە
بەبالاتا
پەل و پۆی خۆی هەلکردووە

**کفرەحمەد**

کفرە حمەدیش
کە داوای کرد کەر بتۆپێ و گاکەیان کوشت
پەلی کوێرێکی راکێشاو بردیە گەوڕ
وتی:
«ئادەی گا و گوێدرێژ جیا کەرەوە»
ئەمە گوێیە وا تەپەی دێ
ئەوەیش شاخە بەسەرەوە

١٩٨٦/٤/٩

**باران**

باران، باران
بەو پاکییە بەو جوانییە
خوڕ بێ و نمە
لە کێڵگەدا دانەوێڵە و لە ناو باخدا گوڵ ئەروێنێ
لە رەقەندا، ئەشکێ و ئەرژێ
لە سرکەوانی بۆگەمدا
چی بە سەردا و چی دەردێنێ؟

١٩٨٤/٥/١٠

**چاوم**

بە چاومم وت: ئەرێ بۆچی وەکوو جاران
شاپەڕی تۆ ناکرێتەوە؟
ئەی وەڵامی پرسەکانت
بۆچی ئێستە نادرێتەوە؟
ئەی بۆ لە ناو برژانگیشتا چرای خەندەت کز کراوە؟

بۆچی نزیکت لا دووره و دووریش نزیک؟
سامالی ئەو گۆمه روونەت تەم دەی تەنێ و
مانگ و ئەستێرەت وێڵ دەکات
خەون و خەویش بێزار بوون
کەوتوونەتە داد و شکات؟
وتی جۆگەی بێ جۆمالم
چەمی فرمێسکی هاتووی تۆ ناکێشم
کەی من چاوم
من ئەمێستا دەردی خەمم
تا کەی ئەم دۆخە راکێشم؟

١٩٨٨/١/٢٨

**ملوانکەی شاعر**

کچە کوردێک شیعرێکی خۆی دەخوێندەوە
تالی هۆشمی وەها هەڵکرد
چاوم ئالایە پەرچەمی
خۆزگەم بوو بە ئەو مەیدێرەی
هەرچی شەربەتی شیرین بوو
هەڵی دەبڕی بۆ لای دەمی
هەر وشەیەک لەسەر پەڕەی لێوی ئاڵی دەگیرساوە
حەزم دەکرد بە زمانم هەڵی رفێنم بەرەو خۆم
حەزم دەکرد ببمە باران
باری لێوی شیعری بسۆم
حەزم دەکرد وەک چاوچنۆک نوقلی دەم و چامە و شیعری
هەڵگرمەوە و گشتیان بخۆم

حەزم دەکرد هەتا دنیا ئاخر دەبێ
نە ئەو بڕوا و نە من بڕۆم
ئیتر گیان و هەست و بیرم بوون بە حەرفی ناو دەفتەری
هەرچی شیعرو بەستەم هەبوو
بوون بە گوڵێک دام لە سەری
بیرۆکەیەک هات بە سەرما
تێر بیمژم دەست و پلی
هیچم نەبوو خەلاتی کەم
هەردوو قۆڵم وەک ملوانکە
کردە ملی

**ئەتهێنمەوە**

ئەتهێنمەوە بە نیم نیگایەکی گەشم
ئەتکەم بە نوێنی ئارامی گەرمی لەشم
نابێ خۆتت لێ بگۆڕێ
چۆنم بۆیێت ئەبێ وابێ
کە بووم بە گەرداوی تووڕە
نەبێ بە ڕێگەما دابێ
چۆنم ویستێت ئەبێ وابێ
ویستم هەڵ بێت، ئەبێ هەڵ بێیت
کە نەمویستی زوو ئاوابێ
ئەتهەژێنم
چۆن ڕەشەبا
پەڵەی گەنم لە پێ دەشتا
دێنێ و دەبا

ئەتسووتێنم لە پێ تا سەر
چۆن بای شەماڵ تیلەی ئاگر ئەداتەبەر
ئەتتۆرێنم
بە یەک تیلەی رقی چاوم
لە رووت نەیێت بڵێی خەڵکە
دڵ شکاوم

١٩٦٩

**سیزیفی ئەندێشە** ..........

کە سیزیفی ئەندێشەی من
لووتکەی عومرم دابین دەکات
تاشەبەردێکی دی دێنا
بۆ چییەتی و بۆ کوێی دەبات؟
کێ دەزانێ وەڵامێکی وام بداتێ
ئاوێک بکات بە ئاگری بێ خەویمدا؟
جۆگەییێکی خوڕ راکێشا بە ناو شەقاری زەویمدا
هەتوانێکی بازار و ژەنگ بکرێتەوە و
هەڵیبخات بە لێوی زامی «علی»م دا
کێ دەتوانێ و کێ دەتوانێ
کۆڵی قورسی سیزیفەکان بخاتە سەر دەمی ژانێ؟
کێ تیرێکی وا دەشانێ
دوو جام ئازادی هەڵبدات
ئەوسا دەس باتە گوێی نانێ؟

١٩٨٨/٣/١٦

**حەزم ئەکرد** ..........

حەزم ئەکرد، هەموو دەنگی ئەم دنیایە
هی من بوایە
لەسەر لووتکەی پیرەمەگروون
راوەستایەم وەک ئالایە
هەر بانگی تۆم بکردایە
هەر ناوی تۆم ببردایە
حەزم ئەکرد داری بەریی ئەم دنیابم
لە ناو باخ و رەزی تۆدا

# سواره ئیلخانی زاده

سالـی ١٣١٦ک.هـ لـه دایـک بـووه.
کـوڕی ئەحمـەدئاغای ئیلخـانی زاده
سەرەک عەشیرەتی دیبوکریە.
خوێندنی سەرەتایی تا تەواو کردنی ناوەندی هەر لە بۆکان خوێندوویەتی.
سالی ١٣٤١ لە تەوریز دیپلۆم وەردەگرێ.

سالـی ١٣٤٣ دەکەوێتە بـەر پـەلاماری ڕژیمـی حەمەرەزاشـای پەهلـەوێ و بـۆ مـاوەی ٦مانـگ دەخرێتـە ژێـر ئـازارو ئەشکەنجەوە.
سالی ١٣٤٧ زانکۆ تەواو دەکا و لیسانس وەردەگرێ. سالی ١٣٤٦ لە رادیۆ کوردی تاران دادەمەزرێ و دەبێتە مووچەخۆری حکوومەت.
سالی ١٣٤٥ ترۆمبیلێک لێی دەدات و پاش چەند رۆژ مانەوە لە نەخۆشخانە مالاوایی لە هەموان دەکاو بنەو بارگەی بەرەو دیاری خامۆشان لێک دەنێ.

## شار

گولم!
دلم پره له دەرد و کول
ئەلێم برۆم له شارەکەت
ئەلێم به جامی کانیاوی دێیەکەم
عیلاجی کەم کولی دلی پرم، له دەردی ئینتزارەکەت
وەڕەز بوو گیانی من له شار و هارە هاڕی ئەو
له رۆژی چلکنی نەخۆش و تاویاوی شەو.
ئەلێم برۆم له شارەکەت
له شاری چاو لەبەرچرای نێئۆن شەوارەکەت
برۆمە دێ که مانگەشەو بزێتە ناو بزەم.
چلۆن بژیم له شارەکەت
که پڕ له دڵ دژی گزەم؟
له شارەکەت که رەمزی ئاسن و منارەیه
مەلی ئەوین غەوارەیە
دەڵێی له دەوری دەست و پێم
ئەوەی که تێل و تان و رایەلە: کەلەبچەیە
ئەوەی که پەیکەرە: میسالی داوەلە
ئەوەی که دارەتێله: هەر ئەڵێی قەنارەیە.
دووکەڵێ که دێتە دەر له مالی دەولەمەند
تیشکی بێ‌گوناهی خۆرەتاو ئەخاتە بەند.
من کوڕی عەشیرەتم
هۆگرم به ئاسمانی شین و سافی سامرەند
له شاری تۆ له عەرشه قوندەرەی دڕاو

شاری بێ بەهاری تۆ
تەسکە بۆ ئەوین و بۆ خەفەت هەراو.
گوڵم! هەرێمی زۆنگ و زەل
چلۆن ئەبێ بە چارە گول؟
کێ لە شاری تۆ،
لە شاری قاتڵی هەژار
گوێ ئەداتە ئایەتی پەڕاوی دڵ.

**سروەی بەیانی**

تۆ وەکوو
سروەی بەیانانی بەهاری
تۆ لە لەشما
گیانی سووکی نادیاری
بۆ شەوی خۆشی و نەخۆشیم
یادگاری ڕەمزی ئینتیزاری
تۆ جریوەی دارستانی جێژوانی
بۆ هەسیرەی بەرزی ئاواتم زریوەی
چەندە جوانی
گیانەکەم!
جاران کە ئەتکوت
پێکەنینت زایەڵەی سەوزی شەتاوە
جامی شینت گۆمی مەندی پڕ لە ماسی
زەرد و سووری بەر هەتاوە
ئێستە بۆ وا شۆڕەبی برژانگی نەرمت دەوری داوە
بۆچی گەرمایی ڕوانینت نەماوە؟

**من زیندووم**

ئەگەر دێوی دزێوی مردن
بە پێکەنینی ناحەزی هەمیشەییەوە
بەسەرما بدا
گیان و دڵی پڕ خەمم لە ناو بچێ
وا مەزانن من مردووم، من زیندووم
ئەگەر چرای ژینم
لەسەر سەرینی سەرەمەرگم
پرشنگی ساردی دوایی بدا
وە دوا تریفەی بێ
وامەزانن من مردووم، من زیندووم
ئەگەر زەنگی کلیسا
بانگەوازی مەرگم بکا
عفریتی مردن بە قاقا بکەوێتە شوێن تەرمی ساردوسڕم
وا مەزانن من مردووم، من زیندووم
ئەگەر پیاوانی نزاکار
وە ژنانی شینگێڕ و خۆ داپۆشیو
لەدوای دارە تەرمم
پرمەی گریانیان بێ
وە داری عوود بسووتێنن
وا مەزانن من مردووم، من زیندووم
ئەگەر بە ئەسرین و فرمێسکی چاوی کەژاڵی دەزگیرانم
بە ئاوی چاوی کەس‌وکار و دۆست و هاواڵم
گیای گۆڕم بخووسێ

وا مەزانن من مردووم، من زیندووم
بەڵام ئەگەر گۆڕی من بێ ناونیشان
لە گۆشەیەکی ئەم جیهانە پانەدا داکەوێ
وە بیرەوەریم لە یادی خەڵکا بێ ڕەنگ بێ
ئاخ! ئەوکاتەیە کە من ئەمرم.

١٣٥١

**بۆ کچە کوردێ**

دزەی نیگای ژێر تارای شەرم و ناز
سەرنجی کێشام کیژی کرچ و کاڵ
ئەی پەریزادەی ئەوپەڕی جوانی!
لەو ساوە کە تۆ
بازی نازی چاو
بۆ منی کلۆڵ ئەنێریتە راو
دڵ وەک دوو تەپڵەی
سوارەی کوردی
جوانووی نەگیراو
مەیل ئەخاتە باڵ
خەرمانەی بۆنی زولفت لەسەر شان
بۆی کێوی شەوبۆ فەسڵی درەنگان
تێریتە بیرم
چاوە کاڵەکەت
هەسارەکەی رۆژ بۆ ریبواری شەو
یا خۆ قاسپەی کەو لەدەم بەیانا
بۆ هەوارنشین، هەوارگەی شاهۆ

تیریته بیرم
که رووی وتارت ئه‌که‌یته لای من
سروه‌ی به‌یانی، ئازیز شنه‌شن
تیریته بیرم.

# شێرکۆ بێکەس

شێرکۆ بێکەس کوڕی مامۆستا فایەق بێکەس لە ساڵی ۱۹٤۰دا لە شاری سلێمانی چاوی بە سەر دونیا کردۆتەوە. ژیانی شێرکۆ ئاوێتەیەکە لە خەبات و خۆشەویستی. ئەم دوانەش وەکوو جمکێکی پێکەوە نووساو لێک دابڕانیان نییەو دوو چاوی یەک پەیکەرن لە شیعرو ژیانی شێرکۆدا. بە وتەی شاعری مەزنی فارس سەید عەلی ساڵحی:

شێرکۆ ئیمپراتۆری شیعری دونیایە.

بەرهەمەکانی شێرکۆ:

کازیوە، دەربەندی پەپوولە، بەردە قارەمان و مامەیارە، من تینوێتیم بە گڕ ئەشکێ، دوو سروودی کێویلە، هەڵۆ، کەژاوەی گریان، خاچ و مار، رۆژمێری شاعرێک، تۆ ئەتوانی بە قومێک ماچ بمخەیتەوە هەڵقوڵین، کاوەی ئاسنگەر (شانۆنامە)، پیرەمێردو زەریا(چیرۆک وەرگێڕانی هێمینگوی)و ... .

لە ساڵی ۱۹۷۸دا خەڵاتی جەهانی «توخولسکی»(خەڵاتی ئەدەبی) لە دەست سەرۆک وەزیرانی وڵاتی سوێد «ئینگوار کارلسن» وەرگرتووە.

لە لایەن ئەنجومەنی فلورانسی ئیتالیاوە(گەورەترین ئەنجومەنی شارستانی ئیتالی) نازناوی «هاوشاری» پێدراوە.

شیعرەکانی بە زۆر زمانی دونیا وەکوو: ئالمانی، فەرانسی، ئیتالی، سویدی، نۆرویجی، عارەبی، فارسی و ... وەرگێڕدراون. هەندێ لە شیعرەکانی هەڵبژێردراون و کراون بە وانەی قوتابخانەی چەن ولاتێک.
بێگومان شێرکۆ یەکێک لە خودانی مێژووی ئەدەبی جیهانیەو لە ریزی کەسانێکە وەکوو: لۆرکا، مەحموود دەروێش، ریتسوس، نیرودا، داستایۆسکی، شاملوو، جوبران خەلیل و ... .

**زیندووی، مردوو**

«دوژمنت نیم چونکە پێت پێناکەنم،
دۆستتم بۆیە ئەتگریێنم و ڕاستیت لێ ناشارمەوە».

دوو هەزار و پێنج‌سەد ساڵە
مێژوو ئەڵێ لەدایک بووین
دوو هەزار و پێنج‌سەد ساڵە
زرپ و زیندووین
بەڵام هێشتا، باوێشک ئەدەین
هێشتا نووستووین
هێشتا تەواو تێرخەو نەبووین
هێشتا ئەنووین
دوو هەزار و پێنج‌سەد ساڵە
لە خەڵک بوردووین
لە خۆمان هەرگیز نەبوردووین
دوو هەزار و پێنج‌سەد ساڵە
وەک ئێستە واین
یەک نەگرتووین
لەو کاتەوە چەک هەڵگرتووین
بەڵام هێشتا سەرنەکەوتووین
کەچی ئەڵێین: هەر سەرکەوتووین
ئەڵێن ئێمە هەر نەمردووین

***

هەر لێرەوە تا وڵاتی
بەرینی چین

بە نۆکەری گەڕاین ڕۆشتین
بە ئاواتی
سەرکەوتنی
بێگانە گەلێ گەیشتین
لە خوێنی خۆمان بۆ ڕشتن
لە ڕۆڵەی خۆمان بۆ کوشتن
تا توانیمان قسەی زۆری
مەراییمان بۆ هەڵبەستن
سەمامان کرد، بۆمان ڕستن
وتیان ئادەی دنیا بگرن
ئەوە پارە!
وتمان: باشە
وتیان بمرن، ئەوە پارە!
وتمان: باشە
وتیان ماڵی یەکتر ببڕن
لە ناو یەکا، یەک سەرببڕن
ورگی یەکتری هەڵدڕن
ئەوە پارە!
وتمان: باشە
دوو هەزار و پێنج سەد ساڵە
پێمان ئەڵێن:
بەرد بن، دار بن
ئەڵقە لە گوێ و خزمەتکار بن
مەڕ بن، مار بن

ئادەی ئینجا شێت بن، هار بن!
ئەڵێین: باشە
بتی دار و بەردمان پەرست
تاجی هەزار، شای بێگانەی
خوێنەخوێمان
دانا و پەرست
چەند پێلاوی دوژمنانی
تازە و کۆنمان
جووت کرد، پەرست
ئەممان پەرست، ئەومان پەرست
دوو هەزار و پێنج‌سەد ساڵە
تەنها هەر خۆمان نەپەرست
دوو هەزار و پێنج‌سەد ساڵە
دێین و دەڕۆین
وەک شێت ئەخۆین
سەرمان قاڵە
چەنە ئەدەین، هەڵئەپەڕین
سەرچۆپی نۆکەریی ئەگرین
کەچی دەستی کردەوەمان
هەر بەتاڵە
گفتمان لاڵە
***
دوو هەزار و پێنج‌سەد ساڵە
مەشکەی دوژمنمان ئەژەنین

چونکە شلقەی زل و خۆشە
بەهی خۆشمان پێئەکەنین
***

ئەوەی گیانی رسوا ئەکرد
رۆیی و زوو مرد
ئەوەی کڕنۆشی نامەردی
ئەبرد، زوو مرد
وەکوو ئێستا
دوو هەزار و پێنج‌سەد ساڵە
ئەوەی پیاو بوو لە ناومان برد
***

بۆ شاردنەوەی ئەنگی خۆمان
دەلاقەی گەورەی، درۆمان
بۆ ئەوەی خۆمان تەفرە دەین
وەک لەوە بەر هیچمان نەکرد
هەر هیچ نەکەین
هاتین گەڕاین
کەوتینە دووی گزی و فزی
لە قوژبنی مێژووی کۆندا
خوێندەوارمان کەوتنە دزی
دزی کردن لە شانازی
کەسانی‌تر، مایە و مووری گەلانی تر.
هەموو دنیایان کرد بە کورد
پێغەمبەرانیان کرد بە کورد

هەتا ئادەم و حەواشیان
هەر کرد بە کورد
نەیان پرسی:
ئەی بۆچی کورد
دوو هەزار و پێنج‌سەد ساڵە
بۆ خۆی، هیچی بە هیچ نەکرد!

مارتی ١٩٦٩

**خوێنە کۆلا**

کورد دووکەڵ و دووکەڵ کێشی
چوار کارگەیە
خوێنە کۆلا دروست ئەکەم
خوێنە کۆلا
لە ئەنجومەنی ئاشتییا ئەخورێتەوە!
ئاخ! زەمانی خوێنە کۆلا
کێ قورپ ئەدا بە دەروازەی کارگەکانتا!

**مامە خەمە**

مامە خەمە قسەی گرە
کۆڕی پیاوە خەساوەکان ئەسووتێنێ
رستەکانی تەور داسە
نێرگەی زمانە لووسەکان ئەبڕێتەوە
مامە خەمە برینێکە
لەسەر چەقۆ دائەنیشێ
پێخەفێکە

شەهیدەکان لەسەر سنگی رائەکشێن
مامە خەمە کتێبێکە،
چاوی شار ئەخوێنێتەوە
زنجیرێکە بەندیخانە پێوەند ئەکات
مامەخەمە ئەجەلێکە
بەرەو مەترسیی رائەکات.

## رۆژژمێری پێشمەرگەیەک

-١-

هەورازی قووچ چاوی زاتمان
ئەترسێنێ
رێگە ماری شەوی دوژمن
بەسەرمانا ئەفیشکێنێ
یەکەم هەنگاوی بەرەو ژوور
بۆ لووتکەی بەرز، بۆ لووتکەی دوور
ئەژنۆی رۆشتن ئەلەرزێنێ
بەڵام ئەڕۆین، چونکە ئەسپی
شەهیدانی لوتکەی بێ سوار
بەسەرمانا ئەحیلێنێ

-٢-

پێمان رووتە، دڕک و داڵە
دەممان وەک گەڵای داری «بی»
تفت و تاڵە
بەڵام ئەڕۆین. چونکە ئامانج

تیشووی هەر چوار وەرزی ساڵە

-٣-

وەک دڵۆپەین
لە ئاسنیشا دائەدەین
بە تکەی ئارامی باوەڕ
پشتی ژێر دەستی کون ئەکەین

-٤-

جێگە زامی قووڵ کوانووە
خوێن مەشخەڵی گڕ گرتووە
تا ئەو زام و خوێنە هەبن
شاخ پێدەشتە بۆ سەرکەوتن

-٥-

لەسەر سەلیبی کورستان
لەبەر چاوی هەموو جیهان
ڕۆژێ دەیان مەسیحی کورد
ئەکرێن بە قوربانی ژیان

-٦-

مافی مرۆڤ درۆیەک بوو
ڕۆژێ لە ڕۆژان لە دەمی
هەڵوەڕی
مێژوو دەرچوو

-٧-

لە دوای ساڵێ
بێ تەل هەواڵێکی دامێ

وتی دوێنێ بەیەک بۆمبا
ماڵەکەتیان سەرنگوون کرد
کەست نەما
وتم کەواتە هەر بژی
ئەنجوومەنی بەرزی ئاشتی

-٨-

لە ئەشکەوتا پرسەم دانا
بۆ ئەوانەی تا گۆڕیشیان،
نییە بە ناو کوردستانا

-٩-

تەنیا لە لوولەی تفەنگدا
ئازادی چاوی هەڵدێنێ
هەق بانگ ئەدا.
تەنیا هەر لە ئاستی چەکا
داگیرکەر ملی کەچ ئەکا

-١٠-

ئەمڕۆ بەیانی کە لەم سەر
کەوتینە ڕێ بەرەو سەنگەر
ژمارەمان ئەگەیشتە
سی جەنگاوەر.
کاتێ ئێوارە خۆرنشین
بۆ دابەزین
بەرەو بنکە گەڕاینەوە
کە دانیشیتین خۆمان ژمارد

دە ماینەوە!

-١١-

من شاعیر نیم
بەڵام ئەگەر لێیان پرسیم
کام هۆنراوە پەسەند ئەکەی
ئەڵێم ئەوەی
لەسەر لێوی وشەکانی، زەردەخەنەی منالانی
رووت و قووتی کوردی تیایە
ئەو هۆنراوەیەم خۆش ئەوێ
وەک پێشمەرگەی تینوو وایە.

-١٢-

لە نامەی ماندووی شارەوە
لە دەنگی کەس و کارەوە
گوڵی هەواڵی پچوڕکاو
دیڕی گریاو
گەیشتە لام
نۆی حوزەیرانی شەست و سێ
بوو بە نەورۆزی میللەتێ

-١٣-

ئەوەی ئەپرسێ ئێمە چین،
چۆن بەسەر پلەی مردنا
بۆ سەربەستی سەرئەکەوین،
ئەوەی حەز ئەکا بزانێ
بۆ نابەزین،

با پرسیار کا لە هەندرێن

-١٤-

ئەمشەو نۆرەی ئێشک گرتن
هاتە سەر من
ئەستێرە ویستی بمنوێنێ
بێهوودە بوو
کە بەرەبەیان تەماشام کرد
ئەو نووستبوو

-١٥-

لە نهێنی شاراوەدا
تەرمی داگیرکەر ئەبینین
لە ناو نامەی پێچراوەدا
دەنگ و باسی ئێستگەی جیهان
بە پەلە ئەمەی راگەیان:
کە گیڤارا
بەر دەسرێژێ کەوت و کوژرا
بۆ وەرامی ئەم هەواڵە
کە چاومان بۆ کەژ هەڵبڕی
هەر گیڤارای پێشمەرگە بوو
بە دوژمنان پێنەکەنی

-١٧-

ئەم بەیانییە خۆرم دی
بۆ دوا رۆژی نەوەی هاتوو
پێدەکەنی

## بالا

ئازارێکی بالا بەرزم
بێ ئەوەی بچمە سەر شانی
خەمێکی تر
تەنیا بەسەرهەڵبڕینێ
برین لەکوێ بێ ئەبینم
هەزار لە کوێ بێ ئەمبینێ

## قووڵ بوونەوە

کە جۆگەیەک تینوو ئەکەیت
دڵی ڕووبارێ ئەشکێنی.
کە تیشکێ بگری و بەندی کەی
خۆرەتاو لە خۆت زیز ئەکەی
خۆ ئەگەر خۆر بریندای کەی
خوێن لە خۆت ئەکەی بە دوژمن
ئەوەی کە خوێنی ڕووناکییش
ئەبێتە دوژمنی ژینی
تاریکی شەوێک ئەیکوژێ

## قەڵەم

قەڵەمێ سەری خۆی هەڵگرت
هیچ دەفتەر و هیچ کاغەزێ
نەیانزانی

ڕووی لە کوێ کرد
چونکە ویستیان دای بدەن و
خۆی بە خۆی بکوژێننەوە
چونکە ویستیان وا بنووسێ
هەر بە تەنیا سوڵتانەکان
بیخوێننەوە.

**خۆشەویستی**

گوێم نا بە دڵی خاکەوە
باسی دڵداری باران و خۆی بۆ کردم.
گوێم نا بە دڵی ئاوەوە
باسی خۆشەویستی خۆی و
سەرچاوەکانی بۆ کردم.
گوێم نا بە دڵی دارەوە
باسی خۆشەویستی خۆی و
گەڵاکانی بۆ ئەکردم.
کەگوێشم نا
بە دڵی خۆشەویستی خۆیەوە، ئەوسا
باسی سەربەستی بۆ کردم.

**واگۆن**

من ئەزانم هەرچەند بڕۆین
بە یەک ناگەین
وەک دوو هێڵی

شەمەندەفەر وەهاین هەردوو
بەیەک ناگەین
بەلام گیانە ئەگەر لایش دەین
واگۆنی دڵ وەر ئەگەڕێ
ئەوسا ئەزانیی چەند نامە و
شووشە عەتر و
چەند ژوان و چەندە ماچی
خۆشەویستی هەردووکمانی
تێدا ئەمرێ.

**بوخچە**

ڕۆژێ هەنگ بوو بە هاوڕێم
شەوێ قەڵەمەکەم نەنووست
هەتا شیلەی شیعرێکی تازەی نەدامێ
ڕۆژێ کرمی ئاوریشمێکم بوو بە ئاشنا
شەوێ ئاوریشمی خەیاڵم
قەد قەد
خۆی لە وشەمەوە پێچا
ڕۆژێ کۆترێ بوو بە دۆستم
شەوێ ئەوینێکی سپی
هاتە لام و
چەپکی تیشکی دایە دەستم.
ڕۆژێکی تر گوڵەگەنم بوو بە ئاشنام
شەوێ تیرۆکی قەڵەمم ناسکە نانی

وشەی ئالی بۆ کردومەوە و هەتا دوایی
لەسەر سەبەتەی دەفتەرم هەڵمچنی.
بەلام وەختێ کە هەژارانی کوردستان
بوونە هاوڕێم
شیلە و ئاوریشم و تیشک و نانم هەر هەموو
خستە بوخچەی دەروونەوە و
ئەو بوخچەیەشم دا بەوان.

١٩٨٨

## لە گۆڤارێکی بێگانەدا

١- چەک
لە وتاری گۆڤارێکی دوور وڵاتا
لە ناو دێڕی ئازاد بوونی دوای خەباتا
لە بەهاری، باخچەی گوڵی، بەر ئاواتا
لەسەر لاپەڕەی یەکەمین
بەگەوەرەیی، وا نووسرابوو:
چۆن سەرکەوتین؟
ئینجا ئەڵێ: پێش ئەوەی بەلەش راپەڕین
ئێمە بە گیان راپەڕی بووین
یان بەر لەوەی، سەنگەر بگرین،
ئێمەی زیندوو
خوێنمان لەناو لەپی دەستا هەڵگرتبوو.
بەر لەوەی سەنگەر هەڵکەنین،
سەنگەری باوەڕمان هەبوو
لە ناو گیانا، لە ناو بیرا، زۆر لەوەوبەر

ئامادە هەڵمان کەندبوو
ئەو چەکەیش هەڵمان گرتبوو
هەر ئاسنی سارد و سڕی بێ گیان نەبوو
مردوو نەبوو
هەر گوللەیەک، قاڵ کراوی باوەڕێ بوو
لە ناو کوورەی، ژیانمانا
وشەی پشکۆی نەکوژاوەی ئاگرێ بوو
هەر چەک نەبوو
چەک و بیر و زمان و دڵ هەمووی یەک بوو
٢- سەرکردە
سەرکردەمان وەکوو خاکی ئێمەی تینوو
ئەویش تینووی سەربەستیی بوو.
لەگەڵ برسییا، برسی بوو
وەک زستانمان، ئەویش مات بوو
وەک بەهارمان، ئەویش گیانی پڕ ئاوات بوو
سەرکەردەمان وێنەی لە ناو فرمێسکا بوو
کاتی گریان، لە دڵۆپی خوێنیندا بوو کاتی رژان
دەنگی لە ناو دەستی کاری جوتیارا بوو
کاتی کێلان.
سەرکردەمان بڕوای وەکوو،
خۆر رووناک بوو.
وەک دەروونی رەش و رووتی ئەم وڵاتە
سادە و پاک بوو.
سەرکردەمان چاوی وەکوو ئەم کێوانە

بەرامبەر دوژمن سامناک بوو.
بڕوا و چەک و سەرکردەمان لەگەڵ یەکا
لە باوەشی چارەنووسی سەنگەرێکا
بۆ رزگاری، کەوتنە جەنگین
هەتا خوێنی سەرکردەمان... بەسەر چەکان
رژاو تکا
وا سەرکەوتین

نیسانی ١٩٦٩

# عەبدوڵڵا پەشێو

لە ساڵی ١٩٤٥ لە گوندی بێرکت سەر بە شاری هەولێر چاوی بە سەر دونیای پڕ لە هەورازو نشێو کردەوە. وەکوو زۆربەی روشنبیرە کوردەکان ژیانی تاراوگەو دوور وڵاتی دەبێتە بەشی و تا ١٩٧٠ لە وڵاتانی رووسیا، لیبیاو سویس دەژی. بەڵام ژیانی غەریبی ناتوانێ گیانی بزۆزو دژ بە زوڵم و زۆری لە هەوڵدان بوەستێنێ و بەر بە سەرکەوتن و پێشکەوتنی بگرێ.

پەشێو، دوکتوراکەی لە زمان و ئەدەبی کوردیدا لە زانکۆی مۆسکۆ وەرگرتووە.

بێ گومان پەشێو یەکێک لە خۆشەویستترین و خەڵکیترین شاعیرانی کوردە. رەنگە کەمتر کوردێک بێ کە لانی کەم چەن شیعری پەشێوی لە بەر نەبێ و بە ورتە ورت نەیانڵێتەوە. هەرچەند زمان و بیچمی شیعری ئەم شاعیرە بەرزە شێوازێکی نوێیە، کەچی شیعرەکانی بە هۆی هەستکردنی دەردو خەم و ئازاری گەلەکەیەوە، لە ناخی دڵی خەڵکی کوردستاندا رۆچووەو بۆتە زیکری سەر زاری دایکان لە سەر لانکی منداڵیان، رەنجبەران لە کاتی تێکۆشان و

پێشمەرگە لە کاتی شەڕو مامۆستا لە کاتی وانە وتن و کچ و کوڕی لاو لە کاتی دڵداریدا.

پەشێو لە کاتی شەڕە نەحسەکەی براکوژیدا چاوی بەسەر ئەو کارورەهاتەدا نەنووقاند و وەک کوردێکی دڵسۆز چ لە لۆمەی ئەوانەی ئاوری شەڕیان هەڵکردبوو، چ ئاگادار کردنەوەی خەڵکی کوردستاندا دەورێکی کاریگەری هەبوو.

ئێستا لە رووسیاو لیبیدا مامۆستای زانکۆیە؛ هەروەها تا ئێستا ئەم بەرهەمانەی لە چاپ داوە:

- فرمێسک و زام، ١٩٦٥-١٩٦٧.
- بتی شکاو ١٩٦٨.
- شەونامەی شاعیرێکی تینوو، ١٩٧٢.
- ١٢ وانە بۆ منالان و چەند شیعرێکی قەدەغە، ١٩٧٧.
- شەو نییە خەوتان پێوە نەبینم، ١٩٨٠.
- برووسکە چاندن، ١٩٨٠-١٩٨٨.
- بەرەو زەردەپەڕ، ٢٠٠١.
- هەشت خشتەکی.
- پرێسکی عاشقێکی زگماک، ٢٠٠٦.
- دیوانی براکوژی، ١٩٩٤.

**دەفتەری سوور**

ولاتانی تێری جیهان
دەفتەرێکی سووریان هەیە،
بۆ ئەو مەل و گیاندارانەی
کە کوشتنیان قەدەغەیە.

تکا دەکەم لە یۆنسکۆ،
لە دەفتەرە سوورەکەیدا
ناوی منیش تۆمار بکا.
لە ڕاوکەر و بازرگانان
کەوڵ و پێستم ڕزگار بکا.

ئەمن چبکەم!
نە خزۆکم، خشپەیەک هات
بۆ زەندۆڵێک تێتەقێنم،
وەک با تەی کەم خەرەند و هەڵدێر و تەلان.
نە دەعباشم،
بە کەڵبە بێچوو هەڵگرم
کونەشاخێک بکەم بە لان.

ئەمن چبکەم!
نە باڵندەم، عەرد دەرم کا،
دەرگەی ئاسمان ڤەکەم بە باڵ.
نەماسیشم گەرداو هەڵکا،
ناخی دەریا پەنام بدا و
پەی پێم نەبا چاوی خەیاڵ

من هەم ونیم دوو پێیەکم،
کەچی ئەوا زەردەواڵەی دوو پێ دەمخۆن،
تێم ئاڵاون
لە ڕاست و چەپ، لە خوار و ژوور،
سەرتاپام هەمووی برینە،
پەنام بدە،
دەخلیت بم، دەفتەری سوور!

١٩٨٠/٦/٢- مۆسکۆ

**کڕێوە**

کڕێوە بوو، دنیا بولێڵ
لەپم کردە لانەی کلوەبەفرێکی وێڵ.
وەک ئاشقێک، تا توایەوە تێمڕوانی.
کە بوو بە ئاو ناسیمەوە:
لە کوردستان
دڵۆپێک بوو لە ناو کانی.

١٩٨١/١/١- مۆسکۆ

**داگیرسان**

کە سەیری دەکەم
هەردوو گلێنەم
دەبنە کانیلەی سایەی کەپری مێو.
کە ماچت دەکەم
وەکوو دڵۆپێک خوناوی شاخان
دەتکێیتە سەر لێو.
کە بە ئاستەمیش قامکم دەتگاتێ

دەبم بە زەلێک،
دەمهێنێ و دەمبا
وردەشەپۆلی تەزووی ڕۆحئەنگێو.

١٤/٤/١٩٨١- مۆسکۆ

**سەدان ساڵە**

سەدان ساڵە،
لە وێرانەماڵی خۆمدا
کتکەکۆرەی گۆشەی متبەقی سوڵتانم،
سەدان ساڵە،
حەوشوبەرەی خۆم والایە و
لەبەردەرگەی دزانی خۆم پاسەوانم.

***

سەدان ساڵە
ڕۆژێک دەبم
بە مەیتەری والی بەغدا
ڕۆژێک لە تاران کۆتاڵم.
ڕۆژێک لیفکەم
پشتی ژنی سوڵتان دەشۆم.
ڕۆژێک گەسکم شام دەماڵم

***

سەدان ساڵە،
وەکوو چنگێک دانەوێڵە
ئاشی مێژوو فڕێی داوم،
هەرچوار دەورم شارۆچکەیە و
مێرووڵە دەمیان تێ ناوم.

***

سەدان ساڵە،
کاسەسەرم منارەیە،
کێ بێ دەنگی تیا هەڵدەبڕێ.
سەدان ساڵە،
نیشتمانم نێرگەلەیە،
کێ بێ، بە دەمیەوەی دەگرێ.

***

سەدان ساڵە،
لە بەردەرگەی تەکیەی جیهان،
جووتێک سۆلی پینەپینەم،
کێ لە پێم کا بۆ ئەو دەشێم.
سەدان ساڵە
دوای تلیشێک فڕێ دەدرێم.
سەدان ساڵە،
دوای پینەیەک لە پێ دەکرێم.

***

من پشتێکی بریندارم،
لە قامچی خۆم ڕاپەڕیوم
من لافاوێکی لاسارم،
لەو کەنارانە هەڵساوم
کە تەنگیان پێ هەڵچنیوم.
نانیشمەوە، نانوومەوە.
بێئارامم.
ئارامی من چرایەک بوو
ڕەشەبای دەورم خوێنی ڕشت.
بێبەزەییم،

بەزەیی من زەریایەک بوو،
بینیان پێوەنا و هەڵیانمشت.
نانیشمەوە. نانوومەوە.
کە من دان بم، کوا دەرفەت؟
یا من، یا مێروو.
کە من خوێن بم، کوا دەرفەت؟
یا من، یا زێروو.
قەحپەن ئەوانەی پێم دەڵێن:
دان و مێروو برای یەکن
قەحپەن ئەوانەی پێم دەڵێن:
خوێن و زێروو برای یەکن
قەحپەن ئەوانەی پێم دەڵێن
ماسی و چەنگاڵ،
مشک و جەواڵ،
دەست و چزوو برای یەکن.
قەحپەن ئەوانەی پێم دەڵێن:
پەت و گەردن،
گوێزان و موو برای یەکن.

***

وەرن خەڵکە!
لە نێچیر و زام بپرسن،
بڵێن توخوا!
خەنجەر هەیە زام تیمار کا؟
ڕاوچی هەیە نێچیر نەخوا؟
دە خەڵکە، لە کا بپرسن،
قەت ئاگری ساردی دیوە؟

لە هێلانەی مەل بپرسن،
بە نیازی ماچ
قەت مار دەمی تێ ژەنیوە؟
دە لە داربەڕوو بپرسن،
تەوری دیوە داربڕ نەبێ؟
دە لە کەرێکیش بپرسن،
گورگی دیوە کەردڕ نەبێ؟
قەحپەن ئەوانەی پێم دەڵێن:
ماری شیرین ژاریش هەیە،
قەحپەن ئەوانەی پێم دەڵێن:
تەوری برای داریش هەیە.

***

من پشتێکی بریندارم،
لە قامچی خۆم ڕاپەڕیوم.
من لافاوێکی لاسارم،
لەو کەنارانە هەڵساوم
کە تەنگیان پێ هەڵچنیوم.
نانیشمەوە
نانوومەوە
بێ ئارامم.
ئارامی من چرایەک بوو،
ڕەشەبای دەورم خوێنی ڕشت
بێ بەزەییم،
بەزەیی من زەریایەک بوو،
بینیان پێوەنا و هەڵیانمشت!

١٩٨١/٩/٢- پۆتسدام-بەرلین

### گەر سێوێک بوو...

گەر سێوێک بوو، لەتی دەکەم
لەتێک بۆ خۆم، لەتێک بۆ تۆ.
بزەیەک بوو، لەتی دەکەم
لەتێک بۆ خۆم، لەتێک بۆ تۆ
خەفەتێک بوو، بەشت نادەم،
هەڵیدەمژم وەک دوا پەتۆ!

١٩٨٣/١٢/٣١- پراک

### لەدایک بوون

گوێم لە هاواری نەتەوەکەمە
بەلام دڵنیام
جیهانی سبەی گوشاد و روونە
لەدایکبوونی منالم دیوە
قیژە و لینگکوتان
یەکەم نیشانەی لەدایکبوونە.

١٩٨٧/٥/٢٠- تەرابلوس

### تا چرای ئێمە نەسووتێ...

«ئەو گەلەی گەلێکی تر دەچەوسێنێتەوە،
خۆی ناحەسێتەوە». بیرمەندێک

تا چرای ئێمە نەسووتێ
ئێوە هەرگیز رووناکایی
نابینن بە چاوی خۆتان
تا ئێمە دیل و کۆیلە بین
هەر کۆت و نیر
تۆق و زنجیر دەکەین بۆتان

***

قرمان دەکەن

قوڕتان بە سەر!
گەربشمرین
تەنیا دیلی دەدۆڕێنین
چ هەیە لە دیلی تاڵتر؟
گەر بشمرین هەر سەرکەوتووین
کوا لە کۆیلەی شەهید زاڵتر؟

***

قرمان دەکەن؟
قوڕتان بە سەر!
دوای مردنیش
لێ ناگەڕێین
نیشتمانمان بکەن بە ماڵ
لێ ناگەڕێین
گۆشتمان بخۆن وەک قەل و داڵ
گەر هیچ نەبێ دەبینە خاڵۆزەی بێستان
زیوانی ناو دەغڵ و دانتان
دەبینە لم
دەچینە ناو پارووی نانتان
دەبینە مار
پەپکە دەخۆین لە ناو نوێنتان
دەبینە شێرپەنجە و میکرۆب
گەرا دەخەین لە ناو خوێنتان
دەبینە کوان
هەر دەمەو لە جێیەک دەردێین
دەبینە ژان
لە سەد لاوە تێتان وەردێین

دەبینە زێڕووی هەزار پێ
دەم گیر دەکەین لە گەرووتان
دەبینە تامیسکەی سەر لێو
باپشکێوی سەر پێلووتان

قرمان دەکەن؟
قوڕتان بە سەر!
دوای مردنیش
لێ ناگەڕێین نیشتمانمان بکەن بە ماڵ
لێ ناگەڕێین گۆشتمان بخۆن وەک قەل و داڵ.
شایی بکەن، دەیکەین بە شین
پرسە دانێن، کاستان دەکەین بە پێکەنین
دەبینە لەکەی زمان و تانەی سەرچاو
دەبینە مووی ناو خۆراک و خڵتەی ناو ئاو

تا چرای ئێمە نەسووتێ
ئێوە هەرگیز رووناکایی
نابینن بە چاوی خۆتان
تا ئێمە دیل و کۆیلە بین
هەر کۆت و نیر
تۆق و زنجیر دەکەین بۆتان.

١٩٨٣/٧/٢-مۆسکۆ

**دیوەرەو کەر**

دیوەرەیەک بە سواری کەر،
ڕێیەکی دووری گرتە بەر
نەیهێڵا کەر بدا بێنێ

تا ڕێیان کەوتە بژوێنێ
کەر کە بینیی وا لەو ناوە
گیا و گوڵ سەری پێوە ناوە،
مێوانی گەورەی سروشتە،
نە خێو، نە باری لە پشتە
بە زەڕەزەڕ، بە غارە غار
دنیای هەموو کردە بەهار
لە پڕ خاوەن کەری زۆرزان
هەستی کرد وا لەودیو تەلان
هەرا و هۆریا و دەنگە دەنگە
ئیتر زانیی کاری لەنگە
گوتی: «کەرە گیان! گوێ گرە
ئەو دەنگە دەنگی ڕێگرە
هەتا زووە با بارت کەم
لە ڕێگران ڕزگارت کەم».
کەر دایە قاقای پێکەنین
گوتی: قوربان، هاوڕێی شیرین!
بارەکەی من لە خۆت بار کە
هەتا زووە خۆت ڕزگار کە
کە من کەر بم، بارەبەر بم
کورتان لە پشت، هەشبەسەر بم
فەرقی چییە، دەرد هەر دەردە
کەری تۆ بم، یا هی جەردە!

٢٤/١٢/١٩٨٨- تەرابلس

**پێزانین** ............................................................................................................

دەستم گوتیە پەنجەکانم:

با لە مەیدان بتانبڕن
بەڵام هەرگیز نەتانکڕن.
دەمیشم گوتیە زمانم:
من بە درێژیی تۆ دەخورم،
مەپرینگێوە، بئەنگێوە!
سەروبەر بکەی دەتبڕم.

***

گەڕام، سووڕام بە دنیادا
چەند شار ویستیان،
کچ ئاسایی، بێنە دەستم
بەڵام بووکی دیلی ئاسیا
نەیهێشت شایی لەگەڵ هیچیان دابیەستم.
رۆژباش، پەنجەکانم، رۆژباش!
هەتا ئەمڕۆ
ئێوە چەند جار چوونە مەیدان،
درانە بەر شیر و تیران
بریندار بوون، گلانە خوار،
بەڵام بە دیل قەت نەگیران!
رۆژباش، زمانەکەم، رۆژباش!
سوپاس، زمانەکەم، سوپاس!
تا ئێستا چەند جارت بەزاند
کۆشەنی پاوانی گەوران
چەند جار بە ناو کێردەڵانا رجەت شکاند،
کەوتینە کەمینی تەوران

لە خاچی ڕاست و چەپ درای
بەڵام سوپاس...
سوپاس کە تۆ هەر زمانی و
دەستت نەدا کارێکی‌تر.
هەر کلیلی سەری خۆمی و
نەچوویتە ناو زارێکی‌تر.
سوپاس کە تۆ
لە ناو سەنگەری دەممدا
چەکی «نا»ت هەر لەسەر پێیە
لە کاتێکدا دەست بۆ چەپڵە و
دەمیش تەنیا بۆ «بەڵێ»یە

١٩٩٢/٥/١٠- هەولێر

**خوناو** ..........

تۆ دڵۆپەخوناوێکی
لەسەر گەڵای عومری بەهار
تۆ –گیانەکەم!- کچی شەوی
زۆر دەترسم نێزیکت بم،
نە وەک بتکێنی بۆ سەر زەوی

١٩٩٥/١١/١٧- هێلسنکی

**خەڵات** ..........

ژینێکی ترم خەڵات کە، خوایە!
با کورت بێ، وەک هی گوڵ و پەروانە،
بە هەر بستێ عەرد من قنیات دەکەم،
بەڵام تیا نەژیم وەکوو بێگانە

١٩٩٩/٤/١١- هێلسنکی

### گوڵمێخەک

لە باخێکدا
گوڵمێخەکێک دڵمی ڕفاند.
بە خەمساردی
دەستم نایە بینەقاقای بۆ چنینی.
لە پڕێکا
لە جێگەی گوڵ-گوڵم نەدی- خۆمم بینی
ڕاچڵەکیم و بەبیرما هات.
«منیش، ئەمڕۆ،
وەک ئەو گوڵە دەشنێمەوە،
بێپەروام، ئاسوودەم، هێمنم
ئەی کێ دەڵێ، هەر وەک ئەویش،
دەستی مردن نێزیک نییە لە گەردنم؟»

١٩٩٩/٦/١٠- هێلسنکی

### شایی

کاتێ شایی دادەبەستین
یەک چەپکین و دەست لە دەستین،
شلکەبەژن، ئەڵقە ئەڵقە،
شەپۆل دەدەن و شاخ دەکەن.
شان دەبێتە داڵدەی شان و
پێ پێکەوە ڕمبەیان دێ و خاک داخ دەکەن
ئەی تێناگەم
بۆ لە شایی و زەماوەندی ئازادیدا

هەر چاوێک و خەمی سۆمای خۆی دەپێوێ
هەر دەستێک و دەهۆڵی خۆی دەئەنگێوێ
هەر پێیەک و
نیشتمانی دێتە بەرچاو بە پێڵاوێ
هەر سمێڵێک فیرعەونێکە و
لە عەرشی خوای کەمتر ناوێ.

١٩٨١/٧/١١- مۆسکۆ

**بتی شکاو**

بتێک بووی دەسکردی خۆم،
کڕنۆشم بۆ دەبردی،
لە ساتی تەنیاییمدا
سکاڵام بۆ دەکردی.
بەڵام ئەمڕۆ لە دەورت
کۆمەڵی کڕنۆشبەران
تفری نەخشی پیرۆزی
پەنجەی منیان هەڵوەران
شێلایان ئەو شۆخییەی
جێی سەرنج بوو بۆ هەڵبەست
ژەنگیان خستە ئەو دڵەی
پرد بوو بۆ ژێر پێی مەبەست.
کەوابێ، تۆ دارشتەی
دەستم بی و بۆ من نەبیت،
ئیتر بۆچی لە ژێر پێم
ئەنجن بە ئەنجن نەبیت؟

هەولێر-١٩٧٦

## بۆ کچێکی کاڵ

لە دوورەوە ناوت بیستووم
ناشارەزا خۆشت ویستووم
گوایە لەگەڵ شیعرەکانما زۆر ژیاوی
شەوەهای شەو
تەزووی شیرینیان پێ داوی.
نەتناسیوم
بڕوا بکە نەتناسیوم
ئەو جیهانەی تۆ دەتەوێ
هەرگیز لای من دەست ناکەوێ
جیهانی من هەمووی خەمە
زەردەخەنەی ئێجگار کەمە
تەلاری من کەلاوەیە
جێی پەرتووک و هۆنراوەیە.
ئەوەی رووگەی دڵ و چاوە
تەنیا بتێکی شکاوە!

دوور بە لە من،
لە ژینی من،
لە چاوانی بەدبینی من.
دوور بە لە من، لە هەڵبەستم.
لەو چەپکانەی
بۆ شاچەپکێک دەیانبەستم

١٩٦٨/١٠/٢٨- هەولێر

## لەگەڵما بە

گیانەکەم! گەر ژینت دەوێ لەگەڵ منا،

گەر دەتەوێ دەست لانەچێ لە گەردنا
لەگەڵما بە، با هەر پشتم پێت ئەستوور بێ
لەگەڵما بە گەر هات و رۆژێک لە رۆژان
بوو بە تانە تفم لە چاوی دوژمنا
لەگەڵما بە گەر پەتی سێدارە کوتی:
«کڕنۆش بەرە، ناتخنکێنم» قیژاندم «نا».
***

لەگەڵما بە لە پیادەییم رووەو ئاسۆ،
لە بێداری و لە ئارەقەی رەش رشتنا،
لەگەڵما بە، پێکڕا بچین خۆر دەربێنین،
با نەخنکێ لە گۆمی هەوری چڵکنا
ئەو رۆژە چوو کە بتچێنم بۆ ئەوەی شەو
بتدوورمەوە لە ناو پێخەفی نووستنا
***

لەگەڵما بە، خۆ تا ئەمڕۆ لەگەڵما بووی
لە پێمەلەی دەریای ئازاری بێ بنا
لەگەڵما بە، سوێندیش دەخۆم گەر ماندوو بیت
یا کۆڵ بدەی لە رووی هەوراز سەرکەوتنا
جێت دەهێڵم، دەست هەڵدەگرم لە گەردنت،
من چۆن کاروان جێ دەهێڵم لە رێی ژنا

١٩٦٩/٥/٤- هەولێر

**لەبەر دەرگە**

شەو ڕاشکا،
ئەژنۆم شل بوو،
مانگ بە تاقی ئاسمانەوە هەڵپرووکا.
دەرگەکەتم لێ بکەوە

ئەم شەو هاتووم
بۆ چنینی چەپکە نێرگزێکی چاوت،
بۆ وچانێ
بۆ خەونێ، تۆزە گریانێ
لەسەر هەوری قژی خاوت.

***

ئەم شەو هاتووم
ترووسکایی شاری یادگار بانگی کردووم.
لەگەڵ سیمای منالیما،
لەگەڵ خەمی شۆڕەبیما،
هاتووم و ناگەڕێمەوە.
یا پێت دەگەم،
یا وەک مۆمێک
دەسووتێم و دەتوێمەوە.

***

دەرگەکەتم لێ بکەوە!
هەر دلدارەکەی جارانم،
هەر کێلگەکەی بەردەرگەتم،
هەر تینووەکەی بەر کرێوە و با و بارانم.

***

دەرگەکەتم لێ بکەوە!
من ئەو کەسەم،
تا دوێنی بوو،
لە ناو گەرووی ڕووناکیدا دەتشاردمەوە.
لە ناو جامی مەترسیدا دەتخواردمەوە.

***

کات لە ژێر باڵی ئاسماندا
خەریکە باوێشک دەدات.
شوێن- قولەڕەشێکی کپە.
دەرگەکەتم لێ بکەوە،
شتێک نییە شیرینتر بێ
لە خشپەی پێ و چرپەی چپە.

***

دەرگەکەتم لێ بکەوە!
کفت و ماندووی ڕێگەی دوورم.
وەکوو جاران،
کەمێک لە لات دەمێنمەوەو ڕادەبوورم.

شەو ڕاشکا،
ئەژنۆم شل بوو،
مانگ بە تاقی ئاسمانەوە هەڵپڕووکا
دەرگەکەتم لێ بکەوە
دار و بەردی بەردەرگەتان هاتنە تکا.

**١٩٦٩-هەولێر**

**شەونامەی شاعیرێکی تینوو**

-١-

خۆشەویستم!
کە شەو دادێ شەوی پایز،
کاتێ خشپەی گەڵای وەریو
پەلی هەستم دەرگرێ و دەیبا
بۆ کۆتایی و دنیای ئەو دیو،
من بەخێڵی بە کۆتایی گەڵا دەبەم،

چونکە، کە مرد،
هاوڕێی ھەیە دەمی زەردی بنێتە دەم.

-٢-

خۆشەویستم!
کە شەو دادێ، شەوی زستان،
کاتێ دەنووک لە گوێم دەدا ترپەی باران،
کە خۆڵەمێش دادەپۆشێ
پۆلووەکانی ناو ئاگردان
لەسەر دیواری بەردەمم
سیمای تەڵخی دڵدارەکانم ریز دەکەم.
چییان لێ هات؟
بۆ رۆیشتن؟
دەربەستی هیچیان نیم بەڵام،
بەڵام... ئاخ! بۆ ئەوەی یەکەم،
کە ناتوانم لەبیری کەم.

-٣-

خۆشەویستم!
کە شەو دادێ، شەوی بەهار،
کە تاریکی وەک تاڤگەی کل
دەڕژێتە ناو گلێنەی شار،
کە ئەستێرە گەڕانەوە
لە ناشتنی تەرمی ماتی زێرکفتی خۆر
کە پەنجەیەک هات بزواندی
تەلی گیانی پڕ لە ناسۆر
بڕوا بکە، خۆشەویستم!
لەو کاتەدا

بۆ خەوێکی سەر مەچەکت دەگریم... دەگریم
بە گیان، بە لەش، بە چاو، بە گوێ
هاوار دەکەم: برسیم برسیم.

-٤-

خۆشەویستم!
کە شەو دادێ، شەوی هاوین،
کاتێ ئاسمان
پەپوولەی خەو دەبارێنێ، خەوی شیرین.
کە سروەیەک دێ و بە کپی
بە گوێی ناخما دەچرپێنێ
رازی شەو و چوار دەورەم و کوللەی سپی،
بڕوا بکە، خۆشەویستم،
لێرەدا دڵی هەتیوم،
دڵی شەوی گەش نەدیم،
وەکوو مانگی تەنیای ئاسمان
تێر دەداتە پرمەی گریان
گریان... بۆ چەرپای دووکەسی،
بۆ سەرینێکی دووکەسی.
گریان...
گریان...
بۆ چەناکە و بەرگەردنێ
بۆ ئافرەتێک، تا بەیانی
سەر بە سەر سنگمەوە بنێ
گریان بۆ یەک چرپەی شیرین،
گریان بۆ یەک خورپەی شیرین.

١٩٧٠/٧/١٩- کوردستان

**خۆشم دەوێی**

خاتوونەکەم!
بیستووتە ئاسمان چەند دوورە؟
من بارتەقای دووریی ئاسمان
خۆشم دەوێی.
بیستووتە دەریا چەند قووڵە؟
بەقەد قووڵی گشت دەریاکان
خۆشم دەوێی.

***

گیانەکەم، تۆ نووسراوێکی
دێرت بەقەد تاڵی پەرچەم.
من چوار ساڵە دەتخوێنمەوە،
چەند باڵی بیرم لێک دەدەم،
نە تێر دەبم، نە تێت دەگەم.

زۆر دەترسم،
لە ناو دێڕی شیعرەکانما شار بتناسێ
کامێرەی چاوی مەرگەوەڕ
وێنەت بگرێ و هەڵیواسێ.
زۆر دەترسم،
گەر بتناسن، پەنجەکانم هەڵوەرێنن،
شابسکی تۆش بسووتێنن.
بەڵام هێشتا من دەربەست نیم،
هەرچیم دیوە،
هەرچیم بۆ چاوت نووسیوە،
نایشارمەوە،

تا چۆک بدا لە دەروونتا دێوی گومان،
تا گەورە و بچووک بزانن
خۆشم دەوێی،
خۆشم دەوێی سەد بارتەقای دووریی ئاسمان.

١٩٧١/١/٧- کوردستان

## بەفر و پشکۆ

بمزانیایە
جارێکی‌تر
سێبەرم سێبەرت شانە ناکاتەوە،
بمزانیایە
جارێکی‌تر
خەیامی دەروونی هەڵچووت
پێکی وشەی شیعرەکانم ناخواتەوە،
پشکۆی هەزار ئاگردانم
دەهێنایە سەر لێوی خۆم،
تا کتێبی ماچی دوایی بکەینەوە.
بەفری هەموو نسارانم
دەهێنایە سەر لێوی خۆم،
تا پێت بڵێم:
چیتر بە یەک ناگەینەوە.

١٩٧٢/١/١٩- کوردستان

## وانەی دووەم

مناڵەکان!
ئێمە تووشی سەد کوێرەڕێین

چرای بیرمان گەلێک کزە،
هەنگاوی کوێرانە دەنێین.
منالەکان
ئەفسانەکان دەگێڕنەوە:
هەبوو... نەبوو...
هۆزێک هەبوو لە خاکێکا.
پالەوانیان
چاوی کوێر بوو،
هەوای دەورەی خۆی دەپێکا
فەیلەسووفیان
فالچییەک بوو،
شەوان فالی دەگرتەوە،
تا بزانێ کەی دوژمن بۆی
پەت دەخاتە گەردنی خۆی.
پیاو ماقوولیان
کەڕ و لاڵ بوو،
ماوەی کورتی ئارامیشی هەزار ساڵ بوو.
هۆزی نەگبەت
شەوی دەژمارد،
ڕۆژی دەژمارد،
سێ ژەم نان و چەپلەی دەخوارد،
چاوەڕێ بوو کە دوژمن بۆی
پەت بخاتە گەردنی خۆی.

منالەکان!
ئەی بێلانە ژینتاڵەکان!
زۆر لەمێژە دایکەکانی ئەم وڵاتە
مەمکەکانیان
شیری سەربەستی تیا قاتە.
زۆر لەمێژە کێوەکانی ئەم وڵاتە،
پێغەمبەرێکیان تیا قاتە.
منالەکان!
لە ئاگردانی چاوتاندا
من چاوەڕێی زەردەشتێکم،
بێ جێ بەو بتانە لەق کا.
من چاوەڕێی
چەخماخەی ئاڤێستایەکم،
بێ جەرگی تاریکی شەق کا

**وانەی حەوتەم**

منالەکان!
دەسگیرانم کۆترێکی دیاربەکرە
حەزی لە چیا و قاسپەی کەو و ڕەنگی بەفرە.
بۆ گواستنەوەی
زنجیرەی چیام قەف قەف بڕی
ڕۆژمێرم پەڕ پەڕ دڕی.
پەساپۆرتم،
ئاوات و زەردەخەنە بوو،
کلدان و کیسێک خەنە بوو.

کە لە دەرگەی سنوورم دا،
لە باتی ماچ،
ماچی گەرمی دەسگیرانم،
تفی زەردی پۆستاڵرەشێک
هات سواخی دا ناوچەوانم.

**ئەو پەڕی تینوێتی**

ماچت دەکەم.
ئەی گیانی خۆم، ماچت دەکەم
قۆرتی چەناگەت ماچ دەکەم،
نەرمانی گوێت،
گوێ مەمکەکانت ماچ دەکەم.

***

زۆر تینووتم،
لە گەڵ ئەوەی چاک دەزانم
مەمکانت، وەک تۆپەخوێ،
تا ماچیان کەم
نەمامی زەردی تینوێتی
لە ئێسکمدا پتر دەڕوێ.

***

ئەی گیانی خۆم!
لە یەکەم کۆرسی ئەڤیندا،
مەمکەکانت فێریان کردم
ڕێزی بەفری کۆسار بگرم.

چاوەکانت فێریا کردم
ڕیزی کانیی بنار بگرم.
دەمەوێ بگەڕێمەوە
بۆ سەر تەختەی قوتابخانە،
چاوەڕێت کەم،
لە دووەم کۆرسی ئەڤیندا
فێرم بکەی مەمکەکانت بپارێزم،
فێرم بکەی چاوەکانت بپارێزم.

١٩٧٣- هەولێر

**سەربازی ون**

کە وەفدێ دەچێتە شوێنێ
بو سەر گۆڕی سەربازی ون، تاجە گوڵینەیێک دێنێ.
ئەگەر سبەی
وەفدێک بێتە وڵاتی من
لێم بپرسێ
کوانێ گۆڕی سەربازی ون
دەڵێم گەورەم!
لە کەناری هەر جۆگەیێ
لە سەر سەکۆی هەر مزگەوتێ
لە بەر دەرگەی هەر ماڵێ
هەر کەنیسەیێ
هەر ئەشکەوتێ
لە سەر گابەردی هەر شاخێ
لە سەر درەختی هەر باخێ

لەم وڵاتە
لەسەر هەر بستە زەمینێ
لەژێر هەر گەزە ئاسمانێ
مەترسە! کەمێک سەر داخەو
تاجەگوڵینەکەت دانێ.

# لەتیف هەڵمەت

لە سەرەتای حەفتاکانەوە بە دیوانی «خواو شارە بچکۆلەکەم»ەوە شۆڕشێکی ئەدەبی دەست پێکردو توانی لە بواری داهێنان و ئافراندنی ئەدەبیدا ئەستێرەیەکی درەوشاوە بێ.

لەتیف هەڵمەت بە درێژایی ۳۰ ساڵ خزمەت بە زمان و ئەدەبی کوردی یەکێکە لە خودانی رەوت و شێوازی نوێ لە ویژەی کوردیدا.

هەندێ لە بەرهەمە چاپکراوەکانی ئەمانەن:

- خواو شارە بچکۆلەکەمان، هونراوە.
- ئامادە بوون بۆ لە دایکبوونێکی تر، هونراوە.
- پرچی ئەو کچە رەشماڵی گەرمیان و کوێستانمە، هونراوە.
- گەردەلوولی سپی، هونراوە.
- 
ئەو هونراوەیە کە تەواو دەبێ و تەواو نابێ، هونراوە.
- ئەو نامانەی کە دایکم نایانخوێنێتەوە، هونراوە.
- وشەی جوان گوڵە گوڵ، هونراوە.
- سروودی هەژاران، هورنراوە، ۱۹۸۳.
- ئەم رووبارە وشک ناکات، هونراوە، ۱۹۹۱.
- گورگەکانی لەتیف هەڵمەت، هونراوە، ۱۹۹۲

## کوردستان

پیرەمێردێ چووە قوتابخانەی گوندێ
لە حەوشەکەدا راوەستا
دەورەیان لێ دا مامۆستا
ها خاڵە گیان! چیت گەرەکە ها خاڵەگیان؟
پیرەمێردی بەستە زمان
کە لاواز ببوو وەک گۆچان
وتی توخوا مامۆستا گیان
فێرم ناکەی چۆن بنووسم کوردستان؟

## گۆرانییەک

شاعیرە ترساوەکان
ئەی زەلامە بێ ناوەکان
ئێوەن
ئێوەن
هونراوەتان
کرد بە ناڵی ئەسپی سوڵتان
داتان بە ئاو
داتان بە نان
داتان بە ماچ
داتان بە گان
ئەی زەلامە سواوەکان
کێ پێی وتن هونراوەکان
ببەخشنە شاو خەلیفە خەساوەێ
بۆچی تاجی شا پیرۆزە

یا کڵاشی چەوساوەکان؟
ئەو تەپڵەی کە ئێوە لێی دەدەن دەدڕێ
ڕۆژێ دادێ
کۆشک و قەڵای هەموو شایێک
خاپوور دەکرێ
جا ئەو ساتە
کێ هونراوەتان دەکڕێ
ئەی زەلامە پواوەکان
ئەی شاعیرە پێڵاوەکان

**سەرەتایەک**

وشە هەیە لە ئاهەنگ و کۆنگرەکاندا، نەفرۆشرابێ؟
وشە هەیە لەم چەرخەدا بە تۆپزی نەسمرابێ؟
وشەیەکم بدەنێ کە بە مۆری پۆلیسەکان مۆر نەکرابێ
لە دیوانی پاشاکاندا سووک و سەرشۆڕ نەکرابێ؟
وشەیەکم بدەنێ نەوترابێ، نەوترابێ
وشەیەکم بۆ بێنن وەک چرا بێ
تۆ لەکوێ دای ئەی وشەی چاک
تۆ لەکوێ دای وشەی پاک
تۆ لەکوێ دای وشەی ڕووناک
بۆ هەمیشە قەسابەکان
جەندرمەکانی جەنگیزخان
تۆ ئەکەنن وەکوو لاک
ئەی وشەی چاک
ئەی وشەی پاک

وشەی رووناک؟

**لقی هەتاو**

وشەکانم دروست ئەکەم لە یادی
ئەوانەی وا کۆڵیان نەدا لە تێکۆشان
قوڵپی خوێنی چڕی خۆیان بۆ ئازادی
ڕژانە ناو گەرووی تینوی چرای ژیان
وشەکانم دروست ئەکەم ئابەو خوێنە
کەلە شەوی شەپۆل دڕی شارەکەما
لەناوجەرگەی بەندیخانە هارەکەما
لە ئەلبوومی بیرەوەری یارەکەما
لەسەر پەڕەی نەبەزینی گەلانا
لە قوڵایی خۆشەویستی دلانا
بۆ خەبات و سەر فرازی بوو بە وێنە
وشەکانم دروست ئەکەم لە هاواری
ئەو خێزانەی کەوا بەزۆر دەرکراوە
لە گۆرانی تینوی تۆڵەی چاوەڕوانی
ئەو کۆرپەیەی کە لە باوک جێماوە
بە ئومێدی ئەوانەی وا چاوی دڵیان
چاوەڕێیە زەردە بگرێ بۆڵی بەیان
ئەوسا وەکو کڵپەو گڕی بارووتێ
هەر پیتێکم زۆرداریکی تیا ئەسووتێ

**بۆ کچێکی ڕێڕەوی جوان**

ورد برۆ سڵ مەکە زەردەپەڕ خامۆشە
ئەم ڕێیە بە تەنها من و تۆی لەکۆشە

وردە بڕۆ دڵی من پڕکوڵە پڕجۆشە
وردە بڕۆ پەرداخی تێبینی بنۆشە
سڵ مەکە لە نیگای پڕ تاسەو خرۆشم
من بە چاو شیرینی جوانی تۆ ئەنۆشم
بۆ کولمی وا ناسک تەمەنی وا گەیو
بۆ سنگی ئاوا قوت، مەمکی وا دەرپەڕیو
چ لاوێ مەست نابێ ئارەزووی ناجۆشێ
شەپۆلی هەناسەو سکالای نانۆشێ
بە شنە ئەفسوونی بەهارت داپۆشی
تاسانت کام شێوە ئەیخستە دڵ خۆشی
ئێستا هەر وێنەی تۆ ئەبینم لە هۆشما
جلوەی تۆ ئاوازە لە بەستەی خۆش خۆشما
کام پەریت تووشم بووی لەناکاو ئەم کاتە
کە گیانمت وا کردە ئەم دەریای ئاواتە
وردە بڕۆ سڵ مەکە ئەنوارم بنوارە
لە چاوتا متورفەی هەزاران ڕاز دیارە
وردە بڕۆ حەز ئەگری لە ناخی هەناوتا
لە لەشی زیوینی ناسک و پاراوتا
وردە بڕۆ لەگەڵما بەنازێ بێرە دوو
بزەیەک پێشکەشکە بە لێوی ئارەزوو
پڕشنگێ هەڵبکە لە کەلی ژیانما
تەزێکی پڕ لە تام بهێنێ بە گیانما
جێم بێڵی جا مەگەر هەر بگریم لەتاوتا
وێڵ ببم لە تەمی خامۆشی هەنگاوتا

ورد برۆ سڵ مەکە زەردەپەڕ خامۆشە
ئەم ڕێیە بە تەنها من و تۆی لە کۆشە

**سێ هۆنراوە بۆ دایکم**

-١-

نیگای ئازار وەکوو باران
سۆسەی ژینمی تەڕ ئەکرد
پەپوولەی ناو ئاواتی ژان
وەک پەلکە زێڕینە ئەمرد
لە برووسکەی پشکۆی زاما
هاواری دەم ئەتەزی
لە لافاوی هەوری ساما
ئەژنۆی تەمەن ئەلەرزی
لە باوەشی تەنیاییدا
ژوورەکانم پشکنی
خەم لە تاریکاییدا
هەڵیمژیم هەتا بنی
کە خەو چاومی پۆشیەوە
تۆم لە دڵما دۆزیەوە

-٢-

بەیانی بوو چاوی یادم
بە تەزووی ئاخ کرایەوە
هەستم پێکرد کە ناشادم
کڵۆی خەمم توایەوە
چەند پێنتێکم لێ دروست کرد

لە دڵما بوون بە هەڵبەستێ
گریا وەکوو منالی ورد
کەس نەبوو زامی بەستێ
هەرچەن خامەم لکان پێوە
دەستم بۆ برد وەک ناسکە سێو
بۆم نەخرایە ناو چوار چێوە
لەرەی نەهاتە سەر لێو
وەکو چۆلەکەیەکی تینوو
لە قووڵایی دڵما ون بوو
ئەی ئەو دایکەی کە لە دڵمای
وا چۆلەکەیەکی تینوو
بە شاباڵی ئارەزوو
گیانی منی بۆ هێنای

-٣-

باوێشکی شەوی ناو دڵم
خەمێک ئەگرێ وەکو گۆگرد
گڕێکی بێ ڕەنگ و هەڵم
ئەکاتەوە
لێی ئەوەرێ پشکۆی ورد ورد
کەفی چاوی نوقمی سڵم
وەکو دەریایەکی بێ پرد
ئاسۆی دوورم ئەخواتەوە
بۆ ئەم ژانەی تەمەنم
ڕەنگە بگری گۆڕهەڵکەنم

ئەی خۆم چۆن نەگریم دایە
بۆ ئەوەی کەس بڕوای نایە
بلێم دایکم نەمردووە
هەر زیندووە
لە ژینایە
لە قولایی
پڕ لە هەستی
خۆشەویستی
بێ کۆتایی
دلم دایە

**ئاگاداریەک**

من ناتوانم بە زمانی ئێوە بدوێم
ناتانناسم، ناتانناسم
ئەی ئێوە ئەزانن من کێم؟
میوانێکم پەنجەکانم رەشەبایە
فەرهەنگێکم، وشەکانم
وشەی پێش لەدایک بوونی یاسایە.

**تابلۆیەک لەژووری پێشمەرگەیەکی نەناسراوا**

هەتاوێ تر بەدی ئەکەم
لەسەر تابلۆی ژانی رەشی منالەکان
لەقوولایی زامی لەشی سالەکان
لافاویتر بەدی ئەکەم
لەرۆژنامەی پاشەرۆژی هەوالەکان
رووداوێ تر بەدی ئەکەم

ئەو ئەستێرەیەی کە ئەکشێ·
مردنی خۆی وەکوو نامەیەکی پیرۆز
وەکوو پەیامێکی بەسۆز
بەم جیهانە ئەبەخشێ
وەرن... وەرن پۆلیسەکان
بمخەنە ژێر مێخی پۆستاڵە پیسەکان
وەرن وەرن بمبەن بەرەو ئەو شوێنە
وا ئەڵقەی گوریسەکان
چاوەڕێمە
بەڵام هەرگیز ئەوەی پێمە
سڵ ناکات نا لە لیسەکان
ئەوەی پێمە هۆنراوەیەکە خوێنە
گەورەترین وشەی سوێنە

**پەنجەرە ونەکان**

خەیاڵ دەکەم وەک ئەستێرە لە شووشەی هەموو
پەنجەرەیە ونەوە
دێیتە ژوورەکەی منەوە
مناڵم و لە نێوانی مەمکەکانتا یاری دەکەم
مەمکەکانت دارستانە و
منیش منەی لانە پاساری دەکەم
نە ماندوێتی کۆتم دەکا و نە دەخەوم
تۆ دەبیتە پەڵە هەور و
منیش بە پێ دوات دەکەوم

تۆ دەبیتە دار بەڕوویەک
منیش لەسای پەلوپۆتدا تیر دەسرەوم
پەنجەرەیەک لە دڵمدا دەکەمەوە
بۆ جریوەی ئاسمانی شادی داهاتووم
پەنجەرەیەک دەکەمەوە
خۆم دەدەمە دەست شەپۆلی خۆزگەمە

**خەوی سەوز** ..........

گەر لە خەوتا شاعیرێ هات
ویستی باوەشت پێیاکات
ویستی بە زۆر ماچت کات
گەر لە خەوتا شاعیرێک هات
ویستی بترفێنێ و بتبات
ئەوە منم
ئاخر مەگەر من هەر لە خەودا بێم بۆ لات

**دوابڕیار** ..........

هەزارەکان ئەگەر نەبووم بە پەلە هەوری خوێن و
دەستی عەشقی خۆم نەئاڵاند
لە گەردنی کەژ و کێوی ئەم شارە
شیعرەکانم تفرێژکەن و
لقی دار بەڕوویەکم بۆ بکەنە سێدارە
من چیم ئەگەر ئێوە ناوم لەبەر نەکەن
شاعیر کێیە، چییە ئەگەر
ئێوە تاجی لەسەر نەکەن؟
شاعیر چیە ئەگەر هات و شیعرەکانی

منالانی ئێوە نەیکەن بە گۆرانی؟
ئاخر شاعیر کێ دەیناسێ
ئەگەر کچە چەوساوەیەک
خۆی بە لقی شیعرەکانیا هەڵنەواسێ؟

**گۆرانی**

من گۆرانیم نەدەزانی
هەژارەکان فێریان کردم
تووڕە بوونم نەدەزانی
زۆردارەکان فێریان کردم
خۆشەویستیم نەدەزانی
رووبارەکان فێریان کردم
من شیعرم هەر نەدەزانی
دڵدارەکان فێریان کردم
دەست و پەنجەی قڵیشاو و پێی خاوسی
جوتیارەکان فێریان کردم
ئەگەر مردن هەر نەشبوایە
لە پێناوی هەژاراندا من دەمردم

**ئەوین**

هەڵبەستێکی نوێم بۆت نووسی
باڵدار وتی: من بۆی دەبەم
رووبار وتی: من بۆی دەبەم
ئەستێرەی پرشنگدار وتی: من بۆی دەبەم
مانگی مات و خەمبار وتی: من بۆی دەبەم

بەرەبەیان
خۆر بە پەنجە نەرمەکانی
دای لە شووشەی پەنجەرەکەم و هەڵمیسان:
من هەڵبەستە نوێکەت دەبەم بۆ چاو جوان
دڵم کردەوە تۆی تیا بووی
هەڵئەقوڵای وەک ئاوی روون
ئەستێرە و مانگ و هەتاو
شەرم روویانی بردو
یەکە یەکە ئاوا بوون

**گەورەترین برین**

که دایکم مرد
نە ئەستێرەکان هەڵوەرین
نە ماسیەکان کۆچیان کرد
که دایکم مرد
نە فرمێسکێ لە چاوی ئاسمان هاتە خوار
نە باڵدارێ خەم دایگرت
نە گوڵێکی کۆشی بنار
که دایکم مرد
نە مانگ نە خۆر نەگیران
پەرییەکیش لە ژوور سەری
چرایەکی دانەگیرسان
که دایکم مرد
زەوی هەر وەک خۆی مایەوە
بەڵام لە ناو دڵی مندا

دەرگای کۆنی قووڵترین زام کرایەوە
ئای دایە گیان! دووریەکەی تۆ زۆر گرانە
دووریەکەی تۆ نە کرِوزەی تینویتییە
نە زویری و توورِە بوونی دەسگیرانە
لە دووری تۆ زۆر زۆر هۆڵمە
هەڵگورد خەمە و باری کۆڵمە
ئەگەر شەوێ لە شەوان
لە تویی خاکی گڵکۆوە
رووناکییەک دڵۆپ دڵۆپ تاریکاییماڵی و کردی بە
چراخان
وا نەزانی مۆمە، منم، من ئەسووتێم بەدیار تۆوە
ئەی دایە گیان!
بە نوقڵ هەر دەڵێم
نوقڵ
بە برین هەر دەڵێم برین
بە گوڵیش هەر دەڵێم گوڵ
بەڵام دایە!
ئیتر هەتا هەتایە
من بە کێی دی بڵێم دایە؟

**جا رەشەبا چی لەدەس دێ؟**

جا رەشەبا چی لەدەس دێ؟
ئەگەر دارەکان بشکێنێ
خۆ رەگەکان هەر دەمێنێ

جا ڕەشەبا چی لەدەس دێ؟
گەر خانووەکان بڕوخێنێ
خۆ زەوی هەر دەمێنێ
جا ڕەشەبا چی لەدەس دێ؟
گەر چراکان بخنکێنێ
خۆر دەمێنێ
جا ڕەشەبا چی لەدەس دێ؟
بۆ ئەتوانێ خۆشەویستی دڵدارەکان هەڵوەرێنێ؟
جا ڕەشەبا چی لەدەس دێ؟
بۆ ئەتوانێ بەستەی ناخی ئەم سەدەیە
بخنکێنێ؟

**گوڵ**

پایز داسی نا لە ملی خەرمانی گوڵی چیا
لە بناری هەورازێکدا
سورە گوڵێ وتی: بریا
لە داسی شووم ڕزگار دەبووم
داس چپەی سوورە گوڵی بیست
گریمان مایتەوە بە تەنیا
چۆن هەڵدەکەی بە بێ دایک و بێ خۆشەویست
گوڵ بزە کەوتە دەمی:
خۆ هەر نەبێ کچێک دەمدا لە پەرچەمی

**ئاوات**

پاچێکم دا لە پیرە دار
سەری هەڵبڕی و بزووت:

بۆ ئەمبڕی ئەی شاعیرە لاسارەکە؟ بۆ ئەمبڕی؟
- ئەتکەم بە دەرگای ژوورەکەم
بەری ڕەشەبام لێ دەگری
دەمپارێزی لە دز و تەم.
دار زریکانی و گریا
-بۆچی ئەگریت هۆ پیرەدار؟ مەگری، مەگری
گەر منیش وازت لێ بێنم
تۆ پیر بوی و ڕەشەبا دەتبات و هەر دەمری
- گەر ئەمبڕی مەمکە بە دەرگای ژوورەکەت، گەر ئەمبڕی...
- بتکەم بە چی ئەی پیرەدار؟
- بمکە بە تابوت بۆ زۆردار.

**ئەوینێکی تر**

کە منداڵ بووم
شەیدای پەپولەیەکی ئاڵ بووم
شەوێ پەپولەکە سووتا
کە پێگەییم شەیدای کچێکی چاو کاڵ بووم
لە ڕووباری ئاوێنەی چاوەکانیدا
دڵم ئەچوو بە قووتا
کچەکە ڕۆی ون بوو لە ناو ڕەشەبایەکی بزووتا
کە گەورەش بووم
وەکوو دار بەڕوویەک هەڵچووم
شێت و شەیدای وڵاتێک بووم
وا لە دڵی هەزارەها ڕەش و ڕووتا

**ئەڕۆم**

ئەروم دایە
ئەگەر ئیتر نەهاتمەوە
دەبم بە گوڵ لەو چیایە
ئەڕۆم دایە
ئەگەر ئیتر نەهاتمەوە
ئەبم بە بستێ زەوی
بۆ دنیایەک گەورەترە لەم دنیایە
ئەڕۆم دایە
ئەگەر ئیتر نەهاتمەوە
گیانم دەبێ بە رەشەبا و
بە شوێن تۆدا دەدا لە گشت دەرگایە
ئەڕۆم دایە
ئەگەر ئیتر نەهاتمەوە
گیانم وشەی
گشت شاعیرێکی ئازایە

**چرا**

دلم گوم بوو، چرایەکم بدەنێ لەم تاریکیە خەستەدا
بیدۆزمەوە
ئای کچێ! ئەگەر چاوەکانتم بۆ هەڵ نەکەی
دەبمە ناڵە لاسارەکەی جاران و
پەنجەرەکەتان دەشکێنم و
رەشەباتان لێ دەورووژێنم و
خەوی چاوتان وەک رەوە پەرەسێلکەی کۆچەری

دەفڕێنم.
هەموو زەویم لێ تاپۆکەن
بۆ شارەکەی خۆم دەڕۆمەوە
لەوێ کانیەک هەیە
منالی خۆمم تێیا شاردۆتەوە
تۆش بۆ هەر کوێ بڕۆی
هەر لە دڵی منداى
بۆچی نازانی
سنووری ئاسمان و زەوی دڵی منە؟

**چنگێ ئاو**

چنگێ ئاوم لە ناو دجلە دەرهێنا
دڵۆپ دڵۆپ ئاو گریا
وتی: بریا
دەتدامە بەر ئەم هەتاوە و دەبووم بە تەم
لەگەڵ شنەی بایەکدا
دەچوومەوە بۆ بەرزایی
کوێستانەکەم

**مەرگ**

بە منالی لە دارەوە فێربووم کە چۆن
لە ژێر شەستەبارانی شارەکەمدا رابوەستم
لە رووبارەوە فێر بووم چۆن
هەر بڕۆم و پڕ لە گوڵ و نان بێ دەستم
لە پەلکە زێرینەوە فێر بووم
چۆن گشت جیهان

بە عەشقی خۆم ببەستم
لە هەتاوەوە فێر بووم چۆن
دیواری تاریکی بدڕم
لە هەورەوە فێر بووم کە چۆن
بۆ ئەوەی زەوی گوڵ بگرێ
لەسەر لوتکەدا بمرم.

**بزمار**

درۆ نییە
ئەگەر وتیان: لە بازاڕی جیهاندا
قلێ بزمار نەماوە
درۆ نییە
هەمووی لە بەندیخانەکاندا
بە پەلوپۆی دڵدارانی گوڵ و خۆردا
داکوتراوە.

**وڵات**

کاتێ هاتن وایان زانی وڵاتەکەم
ئافرەتێکی رووت و جوانە
پێیان دەکرێ بیبەن بۆ کام ئاودەستخانە
پێیان دەکرێ بیبەن بۆ کام قەحبەخانە
وایانزانی وڵاتەکەم ئافرەتێکی رووت و جوانە
شێت و شەیدای ئەنگوستیلە و مەمکدانە
دەخەڵەتێ بە دوو تەوقە و پێنج شەش شانە
نەیانزانی وڵاتەکەم کەعبەیە
هەزارانێ بە دەوریدا پاسەوانە

**ئەنگوستیلە**

من رەنگە هەتا هەتایە پارەی ئەنگوستیلەیەکم نەبێ
کە بیکەمە پەنجەت
بەڵام گەر حەز بکەی هەتا هەتایە
قۆڵ و باسکم لە گەردنت دەئاڵێنم

**تاوان**

کاتێ هاتم وتم: ژیان
دەریایەکە بۆ هەموومان
هەزاران جار دەمیان بڕیم
دیسانەوە هاتمە زمان
لە گشت گۆشە و شەقامێکی زەوی نوقمی شەوەزەنگدا
چرای وشەی نوێم داگیرسان
گۆرانیم وت، گۆرانی جوان
بۆ شارەکەم
بۆ باران...

**نە، دڵی تۆ بەردیش نییە**

کچێ چاو جوان
ئەگەر دڵت بەردیش بایە
بە برژانگی چاوەکانم هەر دەمکێڵا و
تۆوی ئەشق و خۆشەویستیم تیادا دەڕوان
ئەگەر دڵت دەریایەکی تووڕە بایە
شەوێ خۆمم تێیا دەخنکان
ئەگەر دڵتماڵی دوژمنیش بایە
جارێ تێیا دەبووم بە میوان

ئەی من چ بکەم دڵت قوڵلەی بێ دەرگایە
نە چۆلەکەی شیعرەکانم دەیگاتێ و
نە هیچ بایە
کچێ ئاخر تۆ بۆ نایەی بە برژۆڵەی خەمباری چاو
کەزی و پرچت بۆ دابێنم
ماچی وەکوو شووشە گوڵاو
لێ پژێنم
بە دەستی هەست
بیهۆنمەوە و بیکەم بە جوانترین هەڵبەست؟
کچێ وەرە با سبەینێ کەس نەڵێ:
شاعیرێک بوو هەموو وشە جوانەکانی
جیهانی کرد بە گۆرانی
بۆ نازدارێک
خۆشی ئەویست
هەرچەن گەرم بۆی چڕی.
دڵی نازدار کەڕولاڵ بوو دەنگی نەبیست
کچێ وەرە با شار گشتی
نەیکەن بە قاو و نەڵێن
شاعیرێک بوو کچێک کوشتی

**چل ملیون برووسکە**..........................................................................

قەندیل،

پردێکە لە خوێن و بەفر

لەو کێوە موقەدەسەدا،

باوەش بە یەکتردا دەکەن

قەندیل،

دەریایەکە لە نوور

لەوێ،

تێکەڵی یەک دەبن

هەر چوار رووبار:

رۆژهەلات، رۆژئاوا

باکوور، باشوور

قەندیل،

ئاسمانێکە لە هەڵفڕین

لە وێندەرێ،

کۆترەکانی کوشتەی عیشق

لە شەققەی باڵی خوێن دەدەن

خەج و سیامەند

مەم و زین.

لاس و خەزاڵ

فەرهادو شیرین.

قەندیل،

پردێکە لە خوێن و بەفر

لەو کێوە موقەدەسەدا،

باوەش بە یەکتردا دەکەن:
سنەو قامشلو،
سلێمانی و دیاربەکر.
لەوێ لە قەندیل،
بەفر چەکی هەڵگرتووە
رووبار تەلبەندی کەمینە
باران دووربینی شەهیدی کردۆتە چاو
کانی بە برژانگی خورە،
لە گاشەبەرد
شاسەنگەری هەڵکەندووە
بای تەزیو،
هەردوو دیدەی دوژمنانی،
لە دەرزیلەی
ترس و رۆندک، پڕ کردووە
لەوێ لە قەندیل
شۆڕەژنی وڵاتپارێز،
بەرەو لووتکە
هەنگاو بە هەنگاو، پێ بە پێ.
بە هەڵهەلە
تفەنگ دەهێنێتە سەر پێ
شۆڕەژنی وڵاتپارێز
سینگی دەکا بە کێڵگەی مین
بە دەورو پشتی مەتەرێز

لەوێ
لە قەندیلی سوورو سپی،
ژنان شەستەی
چلوورەی چەقۆو ژیلەمۆن
دادەبارن.
ئەوان بەسەر پشتی ئەسپی،
بەفرو خەبات و خوێنەوە
چل ملیۆن هەورو بروسکەن
چل،
چل ملیۆن شۆڕەسوارن
لەقەندیل لەوێ
لەژێر تۆفی ژەهرو سوژن،
گەریلای پیاو
پێشمەرگەی ژن
لە ڕەشبەلەکی هەڵمەتان
سترانی ئازادی دەڵێن
تاری سەرکەوتن دەژەنن

**ژنە ئەڤیندارەکانی قەندیل لەتێکن لە جەستەی خودا**

کیژەکانی قەندیل
کلۆی قەندن، لە نێو کلۆی بەفردا
لە نێو شابالی هەڵفڕینا، دیلن

کیژەکانی قەندیل..
کلۆی قەندن، لە نێو کلۆی بەفردا.
لە نێو شابالی هەلفرینا، دیلن
پۆلێک خاتووزینن
بالای تفەنگیان لە بالای کاکەمەم
خۆشتر دەوێ.
خوویان داوەتە نارنجۆک،
مەمکە خورتەکانی خۆیان لە بیر چۆتەوە
خوێنیان لە خوێنی شەهید، سوورترە
کچەکانی قەندیل
بە ئاگر لێویان سوور دەکەن
دیدەیان بە باروود دەرێژن
قژیان داوەتە دەست رەشەبا
لە نێو هەگبەیاندا تەنیا،
یەک شانە هەیە،
شانەی تفەنگ.
هەناسەیان، تەمێکی چرە لە پەلکە زێرینە
لە بەر پشتیاندا،
خەنجەرێک و چلێک رەیحان
شەلال لە بۆنی نەهری.
کە شوێن پێیان لە سەر سینگی بەفردا جێدەهێلن،
دەبن بە سەدان ئینجانەی
گولە مێخەکی ئومێد.

ژنە پاکیزەکانی قەندیل
ژیلەمۆی ژێر کەویە بەفرن.
دڵی ئەو رووبارانە دەدەنەوە، کە زریان خوێنی کردوون بە شەختە.
کاتێ رەوە رەوە، لە نێو ئەشکەوتی خەباتا دێنە دەرێ،
کەڵە کێوی حەیرانیان دەبن.
ئەوان لەتێکن لە جەستەی خودا.
ژنە ئەڤیندارەکانی قەندیل
تیشک لە ئاسۆ دەڕننەوە.
گوڵە سوورەکانی بن بەفر چەپک دەکەن
هاکا گەردی بەیانییەک،
بە سەبەتەی گوڵ و رووناکییەوە
رژانە سەر،
شەقامە خەمگینەکانی ئامەد.
رۆژی حـــــەشر
ئەی خودا!
بن باڵم خاڵییە لە کتێب.
پریاسکەم «مسقالە زەڕڕەیەک» تاعەتی تیا نییە.
تفەنگێکم بە تاریکییەوە نەناوە
بە مێروولەیەکی موزعجم نەگوتووە، بە لاقمدا هەڵمەگەڕێ.
پێش باران بە وەرزێک، بەسەر تەرمی گەڵای رژاوەوە، گێڕاومە گەرمە شین
گوێم لە زریکەی ژنێ بووبێت، دووپشک بەسەری دڵییەوەی داوم
بەردێک لە چۆلەکەیەک گیرا بێت، من کەللە سەری خۆم داوەتە بەر
دڵم نەهاتوە سبەینەیەک، بەنێو گژوگیای تەڕو پاراوا، قەددەمێک لێ بدەم،
ترساوم نەبادا،

ئەنگوستە شووشەییەکانی شەونم، وردو خاش بکەم
دەستم بۆ سینگی ژنێک نەبردووە،
گەر گۆی مەمکەکانی، دەنووکی لە ناو لەپی نەدابم
بەسەر شەختەو بەستەڵەکدا، خزیوم، هەردو دەستم شکاون،
بەڵام جنێویکم نەداوە بە زستان
باز، بەسەر شانی خەڵکی بوودەڵەوە نیشتۆتەوە، کەچی بە بازێکم نەگوتوە:
دەک پەڕووباڵت هەڵوەرێن.
فرمسێکم بە چاوی پەپوولەیەکەوە دیبێت، ئاسوودەییم، داوەتە بەر
قرمژنی فیشەک.
دڵم پڕ سۆزترە لەسەردوولکەی عیشق
مێزی داوەریم سپی ترە لە باڵەفڕکەی بەفر.
ئەو دەمەی دێمە بەر دەمت
ئەی خودا!
بن باڵم خالییە لە کتێب.
پڕیاسکەم مسقالە زەڕڕەیەک تاعەتی تیا نییە.
لە شەوی «لیلە القدر»ا لە دەمەو مەغریبەوە،
چاوەکانم بڕیوەتە نووری ژن
هەردوو دەستم لێوان لێوە لە مەمک
شەراب هاژە دەکات لە خوێنما.
نەچوومەتە کۆڕی زیکر، تا ردێنی خوێناوی دەروێش، دەفێکی شەهید ببینم.
دووربەدوور نەبێت، مزگەوت و منارەم نەدیتوە.
پەڕەی مەسحەفێکی عوسمانم هەڵنەداوەتەوە.
ماچ نەیهێشتووە،«ڕۆژوو»ێک بگرم و
بەدەم فتارکردنەوەیەکەوە بڵێم « اللهم لك صمت

و بك امنت
و على رزقك افطرت
و لصوم غد نويت»

***

هەمیشە روو لە خودا، هەمیشە مەست
وەک ئاگر،
بە رووتی لە دایک دەبن
بە رووتی سەما دەکەن
بەرووتی پیر دەبن
بە رووتیش دەمرن.

## دوو پارچە شیعر [٣]

-١-

لە سەعات شەشی ئێوارەوە، بە کاتی سلێمانی
سنەوبەرەکانی سەرچنار سەرخۆشن
ئەوان لقیان لە رووباری شەرابدایە
رەگیان لە کەشکەلانی عیشق
لە سترانی ئەواندا، چلێک نیە، گەلاکانی
سێ کوچکەی حەرام بێت
ئەوان لە ئەزەلەوە زەردەشتین.
وەک ئاگر،
بەرووتی لە دایک دەبن
بە رووتی سەما دەکەن

---

3 - ناوی ئەم دوو کوپلە شیعرەم نەدەزانی، بۆیە نووسیم دوو پارچە شیعر. «ف.ئا»

بەرووتی پیر دەبن
بە رووتیش دەمرن
سوورە چنارەکانی سەرچنار، سەر مەستن
مەزەی ئەوان،
دەشتێک زەردەخەنە
ئاسمانێک شێتی
رووبارێک ئەڤین
مەزەی ئێمەش،
قاپێک جاجیک و
بەلەمێک نۆک و
سەبەتەیەک رق.
نێوقەدی هەر درەختێک راتەکێنیت،
پووشینەیەک، شاتووی ماچ خڕ دەکەیتەوە.
کراسەکەی رۆحت، خڵتانی رەنگ دەبێت،
رەنگی مۆر
رەنگی سۆر
رەنگی عیشق
لە سەعات شەشی ئێوارەوە، بە کاتی خۆشەویستی
کالیبتۆسەکانی سەر چنار، ژن دەنۆشن.
ئێمە هێشتا،
شووشەی عەرەق و شووشەی نەوتمان
لێک جیا نەکردۆتەوە،
ئەوان دەستیان گەیشتۆتە، ژنە گەردن شووشەکان.
ئێمە هێشتا،

پێکە سپیەکانمان زین نەکردووە بۆ سەفەر،
ئەوان سەریان لەسەر رانی، خاتوزینێکی خەوندا، ئاسوودە.
شەراب!
ئەی شابالی هەتاو
ئەی گوللە بەند!
توخوا درەختە خۆشەویستەکانی خودا! هەتیومان مەکەن
لە ژێر گەلا هەتیوەکانی خۆتاندا، حەشارمان دەن
لقمان دەخەینە ناو دەستی پەلێکتانەوەو رەدووتان دەکەوین!
بە بازگە ناشەرعیەکانتان بلێن،
ئەو پیاوە دڵبرینانە ئەولادی شەرعی ئێمەن
لە سعات شەشی بەرەبەیاندا، بەکاتی بەهەشت
ئەوان بە پۆلێ چلە گەلاو پۆپی سەرخۆشەوە،
بەسەر پردێکی ئاگردا
بەسەر پردێکی لەزەتدا، دەپەڕنەوە.
پردێک،
لووسترین لە لووس
باریکترین لە موو
تیژترین لە مووس.

-٢-

پیاو!
ئەی مەحکووم بە مەمک، مەمکی دایک،
ئەی مەحکووم بە مەمک، مەمکی یار،
ئەی مەحکووم بە مەمک، مەمکی فیراق،
ئەی درندەترین لێو،

ئەی تەنیاترین مەخلوق!
خودایە!
عەبدێکی زەلیلم
بێ ئەنواو دەلیلم
عومرێکە لە جەنگلستانی مەمکدا، رێ هەڵەم.
تۆ هاورێ و کەسم بە
تۆ فریاد رەسم بە.
مەهێلە ئیدی،
پڵینگە سەر شێتەکانی مەمک،
پەنجە ئیمانداره‌کانم، بقرتێنن.
مەهێڵە، هێشوە پشکۆکانی مەمک،
برژێنە کاسە بەفرینەکانی چاومەوە.
خودایە،
ژەهرێکی خەست ببارێنە،
تا هەرچی برین و درزێکی لەشی ژنە، پێک بگرێتەوە
تا هەرچی لق و پۆپێکی مەمکۆڵەو گەردنە هەڵوەرێ
خودایە!
هەڵمگرە بۆ دوورگەیەک،
لەو دیوی بوون
لەو سەری گەردوون
دوورگەیەک،
پڕاوپڕ لە چەقەڵ
پڕاوپڕ لە گورگ
پڕاوپڕ لە مەیموون.

ژن!
ئەی مەحکووم بە شمشێر، شمشێری باوک
ئەی مەحکووم بە شمشێر، شمشێری مێرد
ئەی مەحکووم بە شمشێر، شمشێری تەڵاق!
ژن!
ئەی توونێلی هەنگوین
ئەی بێ دەسەڵاتترین گوڵ،
تۆ لە ساڵی عیشق و
لە مانگی شەراب و
لە رۆژی ماچا، لە دایک بووی.
منیش لە ساڵی رشانەوە و
لە مانگی فیتنەو
لە رۆژی شمشێردا .
«اهدنا الصراط المستقیم»
ماڵئاوا سێوە حەڵاڵەکانی بەهەشت
مەرگ هات، فرمێسکەسەوزەکانی من و ئینجانەسوورەکانی شیعری، لێک دابڕی
مەرگ هات، مۆمێکی کوێرو گۆچانێکی کەڕی، پێ بەخشیم

# رەفیق سابیر

لە ١٩٥٠ لە شارە جوانەکەی قەلادزێ چاوی بە سەر دونیا کردۆتەوە.

لە ١٩٧٤دا لە زانکۆی بەغدا لیسانسی (بەکالۆریۆس) زمان و ئەدەبی کوردی وەردەگرێ. لە ١٩٧٨دا ناتوانێ لە دەردو ئازاری گەلەکەی چاو بپۆشێ و دەرواتە ریزی پێشمەرگەی کوردستانەوەو چالاکانە پەرای شۆرش دەکات.

پاش دوورکەوتنەوەو ژیان لە تاراوگە رەفیق سابیر ئەمجارەش لە هەولدان ناوەستێ و لە گۆرەپانی زانستدا چالاکانە دیتە کایەوەو دوکتوراکەی لە سەر مێژوو و کولتووری کورد لە زانکۆی «سووفیا» وەردەگرێ.

## لاوکی هەڵەبجە

بە تەنیا جێی مەهێڵن
ئەمشەو زریان دەیچێنێت
تەم ومژ دایدەپۆشێت
مانگەشەو دەیرفێنێت
گەرووی بە گزنگ تەڕکەن
زامەکانی بە شیلان
بە گۆرانی داپپۆشن
یان بە سەوزی دارستان
سەری بە شەپۆلان کەن
با ئەم شەوە رایژێنێت
باڵای لە هەور بگرن
برووسکە و با دەچێنێت
بە تەنیا جێی مەهێڵن
منداڵێکی لاسارە
شار بەردەباران دەکات
مانگ دەکات بە کۆلارە
سوارە، چ شۆڕەسوارێک
ئەسپی هەتاو زین دەکات
بە گۆرانی و تیشک و ماچ
سەر زەمین بەرین دەکات
با کەژاوەی لە گوڵ بێت
یان لە پەلکەزێڕینە
زەماوەندی خوێن دەگرێت

ئەم شەو پاشای ئەڤینە
ئاشقێکی لاسارە
بروسکە و با دەچێنێت
بە تەنیا جێی مەهێڵن
مانگەشەو دەیرفێنێت.

**بۆ تەنیایی** ........................................................................................

دەڵێی ژوانێکە لەگەڵ ئازادی: ساتی تەنیایی.
پردی نێوانی ڕوونی و تاریکی
یان ورشەی کات و شوێنە تەنیایی.
ڕێگاکان واڵا، شەو تریفەپۆش
منیش بەڕێوەم بە تەنیاییدا
دارستانێکی تاریک لە سەرڕێ
مانگ بۆم دەڕوانێ و
ئاسۆ چاوەڕێ.
لە ناو ئاوێنەی ڕوونی تەنیایی من خۆم دەبینم
هەقیقەتێکم ئاوێنەی گومان
جەستەم خاڵێکی شینی کوتراوە لەسەر تاریکی
گیانم دلۆپێک لە دەریای زەمان
دەڵێی چارەنووس پێشم کەوتووە
بە تەنیاییدا بەرەو خۆم دەچم
شەو بۆم دەڕوانێت.
من نیم بە کپی لەگەڵ خۆی دەدوێت،
من نیم گۆرانی تەنیایی دەچرێت

بەڵکە تەنیایی دەمخوێنێتەوە،
من لە حزووردا چۆرێک رووناکیم
شەویش بە ورشەم دەدرەوشێتەوە.
من دڵۆپێکم لە دەریای زەمان
هەقیقەتێکم ئاوێتەی گومان.

**رووت لە بەرامبەری خۆتدا**

رووت لە بەرامبەری خۆتدا
روخساری تریفەگرتووت ئاوێنەی تەنیایی
جەستەت کاتێ شەپۆلی زەمان هەڵدەبڕێت،
ئەلبوومی رەنگە پاییزییەکان
هەنگاوەکانت، لە نێو وێرانەی شوێندا
رووەو دوورین،
نیگای شپرزەت وێڵی قووڵایی.
رەگەکان لە تاریکیدا گەورە دەبن،
تۆیش لە تەنیاییدا.
ساتەکان بەلاتدا دەڕۆن و دەزانی
عومری تۆ کاتێکە لە وەهم، دەزانی
لە نەبوون دەڤەرێک بۆ خەون چێدەکەیت
لە پەیف زەمانێک بۆ جوانی.
ئاسمان بە قووڵایی خۆیدا رۆدەچێت
تۆیش لەبەر شەوقی زیوینی مانگەشەودا
بە ناخی خۆتدا.
تینوو وەکوو لاسکەگیایەک کە بەرووناکی خۆی دەشوا و

تینووتر دەبێت،
خەوبینەر وێنەی گەڵایەک کە بێباکە لە چارەنووسی خۆی
بەرەو ژوانی پاییز دەچێت.
ڕووت لە بەردەم هەقیقەتدا
تەنیا و خەندان لەژوانی ئەبەدییەتدا.

**بەرەو کوێمان دەبات زەمان؟**
پەیڤەکان خۆیان دەنووسنەوە
ئێمەیش خۆمان.
بەرەو کوێمان دەبات زەمان؟
ئێمە دەتوانین بپرسین
کەچی هیچ نالێین
وەکوو بێمانا بێت پەیڤین.
بە ڕێگاوە شوێن هەڵدەبڕین
تا ڕاستی ببینین: چڕ بوونەوەی بۆشایی
ئەبەدییەت ببینین کە وێنەیەکی خۆمانە.
بەرەو کوێمان دەبات زەمان؟
نە بۆ مردن کاتمان هەیە
نە بۆ ژیان.

**ئاشنا بوون**
تۆ بێدەگیت بە دەنگ هێنا و
بە شەقامی ڕووناکیدا
دواى خۆت خستم،

بێکۆتاییت لە کۆتابووندا نیشاندام،
لە وشەدا بە ئەفراندن
لە زایەڵەی بێدەنگیدا بە خۆم
ئاشنات کردم.

١٩٩٩/١١/٣

**لە هەرکوێ بێت**

لە هەرکوێ بێت خەونستانە
بەرەو هەرکوێ سەر هەڵبگرێت
کەژاوەکەت رووناکییە
راستی: هاوەڵ
هەوارت شوێنی زەمانە

١٩٩٩/١١/٣

**خەون... خەون**

لە هەر جێیەک بین جوانی لەوێیە
بۆ هەر کوێ بچین خەون هاورێیە
لەگەڵ خەوندا رێی مەحاڵ دەبڕین
هەر لە خەونەوە فێر دەبین بفڕین.
چ پرسیارێکی تەمگرە واقیع!
چ وەڵامێکی رۆشنە خەون!
چەند گومڕاکارە تیشکی هۆشیاری!
چەند رێنیشاندەرە ترووسکەی خەون!
کات رووبارئاسا بە پرتاو دەڕوات

جوانترین روخسار، بۆ ژوانی عەدەم، گوڵبژێر دەکات
خەونیش مردن و کات و شوێن دەبڕێت
بەرەو دیداری یارانمان دەبات.
خەون رووناکی دێنێتە پەیڤین
کوا ئەوە منم خەون دەیدوێنێت؟
خەون رەنگەکان وەک تۆ دەڕێژێت
تۆ بڵێی من بم خەون بیچێنێت؟
خەون شێوازە، منیش روخسارم
خەون هەڵفڕین، من جووتێ باڵم
خەون جەوهەرە، من شێوە و وێنە
خەون رووناکی نووری ئەزەلە، منیش ئاوێنە

جونی ١٩٩٩

## ئازادی

بۆ ئازادیم دەگەڕێم و
دەستەکانم بە جەستەت بێدار دەبنەوە
تۆ جەوهەری شتەکانیت
قەزای خەون و خەلوەتی گیان.
جەستەت گولووکی رووناکی گرتووە
دەستەکانت داهاتوویان وەک ئاوێنە
بەرامبەرم راگرتووە.
رووناکیت قیبلەی ئەبەدیمە
بەند بوونم *لە تۆدا ئازادیمە.*

## شەونشین

شەوم خستۆتە سەر ڕانم
دەڵێی ئاگردانێکم
بۆ ژیلەمۆم دەڕوانم.
تاریکی سنووری بینین دەتەنێت
باران درەختە خەوتووەکان بێدار دەکاتەوە،
سەرما تاوێرەکان.
منیش گوێ بۆ ڕەگەکان هەڵدەخەم و
بۆ ناخی خۆم دەڕوانم
دەشێت ئەم خۆڵبارانە ناو بنێین: بەهار
دەشێت تەم بکەین: بە دەمامک،
شەو بکەین: بە ماڵ
یان بە فەزای گیان.
بەڵام کوا ئاژاوە بە لۆژیک لێک دەدرێتەوە؟
چۆن ئەم بۆشاییە بێ کۆتاییە
بە جەستە پڕ ئەبێتەوە
کوا پەراوێزێک بۆ ئازادی دێڵێتەوە؟
ئێستا تەنیایی وەک ئاڵا هەڵدەبڕم
شەو بە تریفە دادەپۆشم
جەستەم بە بوولێڵ.
نە چڵێک هەتاو جوانی دەبەخشێت
بە خۆڵباران
نە سروود شانازی
بە نیشتمان
دارستانیش دڵی پڕ ڕازی خۆی ناکاتەوە

بۆ هەورە گەڕۆکەکان.
ئیتر بۆ باڵندەی سەرهەڵگرتوو
لە بیری گەڕانەوەدا بن؟
بۆ باوەڕ بێنین بە بەیان
کاتێک گزنگی خۆی پەڕەوازە دەکات؟
ئێمە بۆ بمرین
کاتێک مردن مانایەک نادات بە ژیان؟
شەوم خستۆتە سەر رانم
دەڵێی ئاگردانێکم
بۆ سەمای خۆڵەمێش دەڕوانم.

**وەرزەبەردینە**

-١-

بە چریکەی گریاناویت رادەبمەوە
لە دوورەوە
روخساری فریشتەئاسات نامۆ دیارە
ژانی زانی لێ دەبارێت،
دەڵێی پەیکەری هاوارە.
بە نێو بوولێڵی ونبووندا
بەرەو رووت دێم
تەزوویەک سەراپای گیانم داگیر دەکات
تا دێم و دێم سیمات کاڵتر دەبێتەوە
خۆشبەزانە وەک جوانووی تۆقیو را دەکەم
«سەحرای عەدەم» بە رووی وێڵما دەکرێتەوە.

لە نێو ئەم چۆڵەوارەدا چاو بۆ زنەیەک دەگێڕم
بەرەو مەرگێکی تر دەڕۆم،
ڕێ ون دەکەم
چارەنووسم بە سێلاوی کۆچ دەسپێرم.
شەوێکی چەند ترسناکە!
پەنجەرەیەکی دەکەمەوە
زەردە بارانێکی بەتاو بەسەر گوماندا دادەکات
ئەستێرەکان لە پێدەشتدا سەرمایانە
مانگ تریفەی خۆی دەنێژێت
ڕەوە کۆچی دارستانە.
ئاژاوەیە، ڕێ ون دەکەم
سەرم بە تۆ دەسپێرم و تەمەن بەم ترس و هەژانە
بە مەرگی پیری گەیلانی دڵم هەر مەکۆی یارانە
سووتانم هەمان سووتانە
هەر ودمی خۆشەویستی تۆ
سێبووری و خەڵوەتی گیانە.
ئاخۆران و باخورانە و سەر دەرناکەم
کەشکۆڵەکەم هەڵدەگرم و
ڕوو لە کۆچێکی دی دەکەم.
هەر سروود و ئەڤینم هەس هاوکۆچم بن
هەموو ڕۆژێ
سووتانی نیوە شەوانم لەسەر گۆڕەکەم
پێدەکەم.
کە لەوێش بووم، گەر بیرت بێت، هەڵوەدا بووم

ئەویٚ شەویٚ
لە دواژوان گەڕاینەوە
لە بەردەم تەنیایی خۆمدا حەپەسا بووم.
من نامۆی نێو شارەکەم بووم
هەر خۆم تەرم و
گوڕهەڵکەن و
خۆم زێوانی گۆڕەکەم بووم.
گەیشتینە سەر کۆڵانە تاریکەکە
باران باری
ڕاستییەکان لەبەر باراندا دووڕوو بوون
ئایندە وێڵ
ڕازەکانمان لە ڕووی باراندا سووتوو بوون.
باران باری و
لە پاڵ تۆدا لە سەمای باران ڕادەمام
باران باری و
لە تەنیایی خۆم ڕادەمام.
پرسیت: چیتە؟
بۆنی پرچی باراناویت شەوەکەی گوڵاوپرژێن کرد
ماچم کردی و هەموو گیانم
نوقمی ڕووناکی و گوڵاو بوو
گەر بیرت بێت، لە هۆش خۆم چووم
مانگ لە نێو زیندانی هەورا
بەرەڵا بوو.
هەر ئەو شەوە

به دەم فیوه راویان دەنام
له نێوانی دوو تاوێردا
له سێبەری دوو شمشێردا
دادەگیرسام
هاوارم کرد: خۆت پەنادە!
زەمانێکی بێ ئامانە
تەمەنمان به خۆڵ دەدێرێت
چارەنووسمان به کۆچێکی وێڵ دەسپێرێت.
زەمانی ئاگربارانە!
چەند هاوار کەین
جیهان مەستی کەرنەڤالی ئاژاوەیه
چەند دوور بارکەین
هەوارگەمان کەلاوەیه.
زەمانێکه
ئەڤین تەمەنی خۆڵاوی ناشواتەوه
درزی دڵ پڕ ناکاتەوه
گوڵەکەم چاوەڕێ مەکه
روباری لێڵ، خنکاوەکان ناداتەوه،
روباری لێڵ خنکاوەکان ناداتەوه.
له ژێر ئەم کەلاوانەدا
چاو بۆ پەسێوێ دەگێڕم
به نێو تەمی چارەنووسدا
روو له کۆچێکی دی دەکەم
تەمەنم به تۆ دەسپێرم.

له شلخەوه تا شار

-٢-

تۆ نەهاتی
ترسێکی وێڵ لەگەڵ پۆلوودا دەیچاندم
خنکاوێک بووم
شەپۆلەکان شێتانە دەیانڕەتاندم
چاوەڕوانی بوو یان رامان
وەک زوقم هەڵیتەکاندم
هەر نەهاتی
برووسکەیەک دای لە گیانم
گومڕایی بوو بە چارەنووس
تەنیایی بە نیشتمانم.

**هونراوەیەک بۆ دایکم**

لە گۆڕستانی ئەم مەنفایەدا
تەنیا وێنەی تۆم لە تیشک چنیوە
بە گەرووی نوقمی سەراب و خۆڵم
گۆرانی عومرم بۆ تۆ چڕیوە
دایە گیان! ڕۆژگار، ڕۆژگاری مەنفا
وەکوو منداڵیم کە ڕووی هەڵێنا
ڕۆحی هەڵوەدام هەتا هەتایە
لە نێو شاکەزی و باوەشتا جێما
وا لە ڕۆژانی دوور وڵاتیدا
خۆر لە نێو دڵدا سێبەر دەچێنێت
بمبوورە دایە!

ئەم شەویش نالەم وەک خەونێکی تاڵ
یان وەکوو زوقمی گۆڕە سڕەکەت
لە شیرین خەودا راتدەچڵەکێنێت.
خۆزگە چاوانی بە کل ڕێژراوت
خۆزگە چاوانی لە خەم گیراوت
بە چەپکێک نیگا
رۆحی شکاوم، وەک چرای نێو با، هەڵدەکاتەوە
یان چنگێک خۆڵی سەر گۆڕی تینووت
وەک نووری یەزدان لە گوناهانم پاک دەکاتەوە
ئەوا تەرمەکەت لە تەنیاییدا
بەسەر ونبووندا شۆڕ دەبێتەوە
درەختی گەردە لە نێو هەتاودا دەشەکێتەوە
ئەوا تەرمەکەت، گۆرانییەکە
خاک رایدەژێنێت،
چنگێک شەونمە سەراب تەڕ دەکات
لە پاڵ ئاسۆدا هەڵدەبێتەوە.
هەروا لە یادمە
لایلایەکانت بارانی خوا بوون
وەک درەختی خۆڵ، دەیانتەکاندم
هێشتا ساوا بووم
بە دەست و پەنجەی فریشتەییانەت
بۆ ڕێی ئازادی و
شەوی ڕەنجدەران داتدەگیرساندم
لە تۆوە فێر بووم

دوندەکان بکەم بە نسێی گیانم
وەک ئەسپی ئاگر لە ئاسۆوە بێم
کام شەپۆل قووچە نەگاتە شانم
لە تۆوە فێر بووم بەرزەفڕ بمرم
بەرزەفڕ بژیم
بەرزەفڕ بڕوانم
بمبوورە دایە!
ئەوا دیسان خۆر، خۆری غەریبی
لە کێڵگەی ڕۆحدا سێبەر دەچێنێت
بانگ و هاوارم وەک خەونێکی ڕەش
یان وەکوو زوقمی گۆڕە سڕەکەت
لە شیرین‌خەودا ڕاتدەچڵەکێنێت
دایە!
بمبوورە
خوایە!
بمبوورە.

کابوول ١٩٨٨

**جۆلانە**

پەلەهەورێک دادەڕم و
دەیکەم بە دەمامک و لانە
دەیکەم بە ئالای ونبوون و
چاوەڕوانی و
تامانی ئەم گۆڕستانە.

پەلەهەورێک دادەڕم و
لە ئاسمانی ڕۆژەکانما
وەک کۆلارە هەڵی دەدەم.
نە، وەک وڵاتە دوورەکەم
بۆ ڕۆح دەیکەم بە جۆلانە.

شام ١٩٨٩

**لەگەڵ ئەم کۆچە کۆچ مەکە!**

لەسەر ئەم هەورە گەڕۆکە مەمنووسەوە
قۆڵەکانم هەرێمی ئەم گومانە نین.
قۆڵەکانم چۆڵەوار و
لانەی تینوێتی و
هاوار و
چەپەری ئەم سووتانە نین.
لەسەر ئەم هەورە گەڕۆکە مەمنووسەوە
لەم شەوەدا
قۆڵەکانم جۆلانەی ئەم هەژانە نین.
زریانە... زریانە... زریان
زامەکانم کلاورۆژنەی ئەم کۆچەن و
گولووکە پاییزەی باران.
ئێوە بێدارتان کردمەوە
لە سێبەری ئەم نەمامە لەرزۆکەدا
چنگێک خۆڵ و پەلکەزێڕینە رادەخەم
کەژاوەیەک بۆ کۆچ لە شەپۆل ساز دەکەم.
لەگەڵ ئەم کۆچە کۆچ مەکە

بازووەکانمان کەژاوەی ئەم تۆفانە نین
نیگاکانمان شەونمی ئەم بەیانە نین
زریانە... زریانە... زریان
سەرم لە هەور ئالاوە،
بازووەکانم کەژاوەن و
بالام درەختی هەتاوە.

شام ١٩٨٩

**بە چیت بچوێنم؟**

بە چیت بچوێنم؟
بە ئاسۆی باران؟
بە ماندووبوون و
خەون و
تینوێتی
یان بە دارستان؟
بە چیت بچوێنم؟
بە پۆلێک هەتاو؟
بە ولاتێکی لە خوێندا گلاو؟
یان بە گۆرانی
بە هەناسەدان،
هەرەس و
لافاو؟
تۆ لە بوون دەچیت، بە چیت نەچوێنم؟
لە نەبوون دەچیت، بە چیت بچوێنم؟

**Eva**

که ئاگر بوویت
نه دەست سووتانم
نه گەرمت دەکردمەوە
که ڕووبار بوویت
نه دەتخنکاندم
نه ساتێک
له باوەشی شەپۆلێکدا ڕاتدەژاندم
ئەوا ئێستایش
گەردەلوولێکی بێدەنگیت
ڕۆژێ دەیانجار هەڵدەکەیت
نه تاوێک لام ئارام دەگریت
نه جارێک، هەر تەنیا جارێک
لەگەڵ خۆتدا هەڵمدەگریت!

١٩٧٧

**لەدایک بوون**

له کەوێلێکی سەرمابردوودا
لەبەر چۆڕاوگە
لەگەڵ برسێتی و ترس و تەزوودا
بێ مامان، بێ کەس، لەدایک دەبێت
له ئەشکەوتێکی دووکەڵاویدا
له نێو هاواردا
له پاشکۆی زیلدا
له ژێر دەواردا
لەدایک دەبێت.

لە نێو بریندا لەدایک دەبێت
لە سەربڕیندا لەدایک دەبێت
لە بۆردوماندا
لە نێو سووتاندا
منداڵێکی کورد لە دایک دەبێت
منداڵەکوردێک
بۆ یاخی بوون و پێشمەرگایەتی
لەدایک دەبێت.

**خۆشم دەوێیت**

ئەوەی دەیەوێت وڵاتی
خۆشەویستیم لێ ون کات
وێنەکەت
لە نێو دڵمدا بسڕێتەوە
با هەنگاوی ڕووبارەکان
بستێک بەرەو دواوە ببات.

**ژیان که پره له خواحافیزی** ..............................

ئیتر
به سادەیی خۆمەوە
دوور و نزیک
بەر لەوەی پاییز بێتەوە
نیوەشەوێک
دنیا مژە
لای راستی...
ریزە چنارێکی به سالاچووەوە دێمەوە
که تەمەنیان
بۆ منێکی پەرش و بلا
منێکی ماڵ له خەرابات
منێکی دڵ له دەروێشان
منێکی خەیاڵ پلاو
وا سانا
مەزەندە ناکرێ
هەریەکەیان
نهێنی خۆی هەیه بۆ ناسینەوە
سەربووردەی خۆی هەیه بۆ گێڕانەوە
هەر یەکەیان
هیلاکبوون و
سکالا و
خەمی تایبەتی خۆی هەیه
هەر یەکەیان

پەیوەندییەکی کۆنی هەیە لەگەڵ زەوی و
رووانینێکی قوڵی هەیە بۆ ئاسمان
هەریەکەیان

***

ئیتر...
بەرلەوەی پایز بە پرتاو بێتەوە
نیوە شەوێک
دنیا مژە
لای چەپی جۆگەلانەوە دێمەوە
کەس سەرچاوەیان نازانێ و
هەریەکەیان
ناوێکیان هەیە بۆ خۆیان
هەر یەکەیان
تەفسیری خۆیان هەیە بۆ مەرگ و
قانوونی خۆیان هەیە بۆ ژیان
تا ئەو پەڕی دنیا دەڕۆن
دەڕۆن و
گۆرانی دەڵێن و ئاوڕ نادەنەوە
دەڕۆن و
دڵیان خۆشە و
هەرگیز ناگەڕێنەوە
بەڵام...
منی شەلاڵ
لە عارەقەی ژوان و

منی تەڕ
لە بەیەکگەیشتنی فریشتانە
منی پڕ
بە لەیکدابڕانی پاییزی
منی تەژی
لە خورپەی بەهاری
لە کسپەی خوداحافیزی
منی سادە
سادەتر
لە دالغە لێدانی پەپوولە
لە بیر کردنەوەی خالخالۆکە
لە هەر کوێیەکەوە بێت دیمەوە
لە هەر
کوێیەکەوە بێت
لەوێوە
کە خەرامان
بەبەر چایخانەکەی رەحیما تێدەپەڕی و
چاکان تامی رێواسیان دەدا
چایخانەکە
پڕ دەبوو لە بۆنی لیمۆ
هەر هیچ نەبێ
لەوێوە
لەوێوە دیمەوە سەرۆک
کە رۆژێ لە رۆژان

لەوێدا
سەد کەڕەت دڵتان شکاندووم
ڕۆژێ لە ڕۆژان لەوێدا
بۆ یاری
ڕێگاکانتان لێ ون دەکردم
بۆ خۆشی
کلیلەکانتان لێدەشاردمەوە
چەند سەیر بوو
لەوێوە
بەیانیان دەچووین بۆ بەرەکانی شەڕ
چەند خۆش بوو
ئێواران
هەر لەوێوە
دەگەڕاینەوە سەر مێزی دانووسان و
بە پێکێک ئاشت دەبووینەوە
چەند خۆش بوو
هەر هیچ نەبێ
لەوێوە...
دێمەوە...

***

ئیتر من
منێکی بێ نوور
منێکی دڵ لە چەند هەوار
ماڵ لە شەوی دەیجوور

ئیتر من
منێک
کە لە کۆترێکی کەڕو لاڵ دەچووم
لەگەڵ هەستکردن بەڕاڕایی و
بە گوناح و
لەگەڵ غوبارێکی وشکدا
لە پەنجەرەکانی پایزەوە هەڵهاتم
بەڵام ئێستا
ئەمێستا من
کە ڕەنگی سەفەر و
کە تامی سەراب و
کە بۆنی گیانی براوم گرتووە
بەر لەوەی پاییز بێتەوە
لە دەرەوەی بەهارەوە دێمەوە
دواجار
قسەیەک هەیە
لە سەفەرا فێری بووم
کە لە قسەی «مەولانا» ناچێ
بە خەیالی هیچەوە
گمەیەک هەیە
لە سەرابا فێری بووم
تەنانەت
لە گمەی شیعری «نالی» ناچێ
بە چۆڕێ میهرەبانی و

به تۆسقالێک غوربەتەوە
دواجار
بەوێدا
بەلای ریزە چنارێکی بە سالاچوودا
کە رۆژێ لە رۆژان
لەوێدا
ئێوە بەراستی غەدرتان لێدەکردم
من بە درۆوە
لە دلی خۆمدا دەتۆرام
بە ئاشکرا
سەد کەرەت دلتان دەشکاندم
من بە دزییەوە
لە دلی خۆمدا دەگریام
دوا جار بەوێدا
بەو رێیانەدا دێمەوە
کەس رچەلەکیان ناناسێ
دەمگەیەننەوە باخ و
دەمدەنەوە بەر هەتاو
بەو توولە رێیەدا دێمەوە سەرۆک
بیرتە
کە هەر خۆم و
کۆلە پشتێک مەراق و
چەند چرکەیەکی هەلبژاردە و
میتۆدێکی ئاغرانەی پێوە دەچووین

بەوێدا
بەو لاڕێیەدا
کە هەر خۆم و
جەڕەیەک شەراب و
چەند دانە هەنار و
حۆرییەکانمی پێوە دەچووین
بەوێدا
بەو نشێوە ڕێیەدا دێمەوە
کە هەر خۆم و
لایتێکی قەڵەمی و
گۆرانیەک بە کزی و
بەختێکی رەشتاڵەی پێوە دەچووین
لەوێدا
لەسەر ریتمی فیکەکێشانێکی بێهوودە
دواجار
سەمایەک هەیە ددیکەم
کە ئاخرین سەمای عومرە
بە دنیایەک غەریبییەوە
دوا جار سەرۆک
قسەیەک هەیە دەیلێم
کە ئاخرین
قسەی عەشقە
بە دنیایەک
مەحزوونیەوە

### بێزینگ

ژنی برۆنزی پشت مینا بە من چی
مەمکی لاستیک، گوڵدانی کریستاڵ و قافیە
ئاوی ناو ئاوێنە، مشت و مڕی بانقەکان
ڕێزمانی بازاڕ بەمن چی
من کەودەنیم
چیم داوە لەشەڕ و گونجانی چینەکان
قەیتان و رەخنە
پۆلیس و فۆلکلۆر
من لەوساتەوە ئازادم،
کە یاسا و سروشتم بەجارێ توورِ هەڵدا
من دەژیم
هەر ئەوەم مەبەستە و چینر نا.

### شەترەنج

بەو چوار گۆشەسپیانە هەڵنەخەڵەتیی
کەس تا سەر لە ناو سپیدا نامێنێ
کەسیش تا سەر لە ناو چوار گۆشەی
قەترانی قەتیس ناخوا
شەو دەڕوا و ڕۆژی بەدواوە دێ
بە هەمان شێوەش وەرزەکان
کەسێ بە ناو پەڵەی رەش و سپیدا بازدەدا
بەسەر لاشەی سەرباز و وەزیردا
بەناو چوار گۆشەی بەتاڵ و پڕدا

کەسێکی جەربەزە باز دەدا
ئەو کەسە ئەسپی رەش دەیبا
ئەسپی سپی پێشی پێ دەگرێ
کەسێکی ئەفسانەیی
لەپێش لەشکردا رمبازی دەکا
فیل لەم سووچەوە بۆ ئەو سووچ
لە خۆرهەڵاتەوە بۆ خۆرئاوا
چەشنی با پەلە پەل دێ و دەچێ
فیل تەنیا لە شەترەنجدا وا خێرا دەڕوا
شەترەنج لە کۆمیدیا دەچێ
سەرباز دەخورێ
فیل دەخورێ
ئەسپ و وەزیریش
هەر پاشا نەبێ
کە کشی لێدەکرێ
خۆی ددمرێ.

سەرەتای ١٩٩٩

# جەلال مەلەکشا

سالی ۱۳۳۰ لە گوندی «مەلەکشا»ی سەر بە شاری سنە هاتۆتە دونیاوە. هەر لە شاری سنە خوێندوویەتی و پەروەردە کراوە. لە منداڵیەوە هۆگری شیعرو نووسین بووەو کوڵی دڵی بە نووسین دامرکاندووە.

جەلال وەکوو مرۆڤێکی ئاشتیخواز نەیتوانی لە هەمبەر زوڵم و زۆردا چاو بنووقێنێ و ئەسپی قەڵەمی لە مەیدانی خەبات دژ بە زوڵمدا تاو داوەو لە سۆنگەی ئەم گەڕناسییەوە تووشی دەردی سەرو ئازارو زیندانی زۆر بووە.

لە سەرەتاوە بە فارسی شیعرو پەخشان و چیرۆک دەنووسی و لە بەر هێزو پێزی لە نووسیندا بە بێ ئەوەی کتێبی چاپکراوی بێ، دەبێتە ئەندامی «کانوونی نووسەرانی ئێران».

پاش سالی ۵۷ لەغاوی قەڵەمی دەگێڕێتەوە بۆ نێو زمانی کوردی و لە کوردیشدا سەرکەوتنێکی بەرچاوی دەبێ. بۆ ماوەی ۱٤ سال وەکوو نووسەرو رۆژنامەوان دەبێتە ئەندامی کۆڤاری سروەو بە راستی پەرای زمان و ئەدەبی کوردی دەکات.

شیعرەکانی تا ئێستا بە زمانانی فارسی، عارەبی، ئینگلیزی، لیبیایی، سویدی و ... وەرگێڕاون.

جەلال ئێستا لە شاری سنەیەو هەرچەن کەوتوتە بەر تووکە شەقی چارەنووس، بەلام بێگومان جەلال لەو نووسەرە دەگمەنانەیە کە قەد قەڵەمی نەبردۆتە قوربانگای نان و ناوو دەسەلات.

**تەنیا**

تەنیا و غەریب
لە چوارڕێیانی گەردوونا ڕاوەستاوم
وەکوو باوە ئادەم تەنیا
لە خاکێکی ڕەش خولقاوم
بەهەشتی خوام لەبەر حەوا فڕێ داوە
بەڵام حەوا
لە دواژوانگەی بەر جەننەتی چاوەکانیا
سێوی کاڵی دڵی بردم
ڕۆیی و ئیتر نەهاتەوە.
ئێستا، تەنیا، تەنیا، تەنیا
لە شەقامە چۆڵەکانی ڕۆحی خۆمدا، سەرگەردانم
وەک شەپۆلێکی یاخیم و
لە دەریای خۆم هەڵبڕاوم
هیچ بەندەرێک باوەشم بۆ ناکاتەوە
ئێستا، لێرە شاعیرێکم
زامەکانم دەهۆنمەوە
گۆرانیبێژێکی تەنیام و
لە شەوێکی بێ بواردا
دەنک دەنک
خەمەکانم دەنووسمەوە

سالی ٦٨

**تۆڵەی چاوپێکەوتن**

ئەی گیانەکەم!

بلا پۆلیسەکان بنوون
زیندان بنویّ
بیّدەنگی گشت بەند و قاوشەکان بگریّ.
دەلاقەی ژوورەکە داناخەم
چاوەڕوانم
بەڵیّنت پیّداوم شەویّ
بخزییتە ناو خەونەکانم.
کاتیّ هاتی دەخیلت بم
کەس نەتبینیّ!
چونکە پۆلیس بە تاوانی نافەرمانی
تۆڵەی چاوپیّکەوتنی تۆم لیّدەستیّنیّ.

سالی ٦٥

**ئاواتیک**

ئاخۆ دەبیّ
ئەو رۆژە بیّ
کاوەی کوڕم
جانتای سەفەر کاتە شانی،
دەلالانی بەر گاراژی شاری سنە
هاوار بکەن:
سلیّمانی، سلیّمانی!

۱۹۸۰-۱۳۵۹

**من رەوتەنیم**

من تاریکم وەک شەوەزەنگ
تۆ گیانی تیشکی، رووناکی

من رووبارم
نائارام و پڕ لە خرۆش
تۆ وەک دەریا
مەنگ و خامۆش و سامناکی
لە دۆزەخی عیشقی خۆتا بمسووتێنە
من جەننەتی چاوی تۆ بە بەهەشتی خوا ناگۆڕمەوە
رۆحی یاخیم دەسەمۆکە
با چەواشەی هەڵدێر نەبم
تۆ تەوەرەی جەغزی ژینی
من هەر بە دەور عیشقی تۆدا ئەخولێمەوە
ئەمە دوایین جارە دەژیم
من خدر نیم
تاوێ تەنیا تاوێ لەلات دادەنیشم
ماڵت ئاوا، من رەوتەنیم.

٧٣/٨/٦

**هەڵەبجە**

هەڵەبجە،
زامێکی ناسۆرە
هەر زووخی لێ ئەتکێ
ئەرژێتە ناو گۆمی گنخاوی ویژدانی سەدەی بیست
هاواری هەڵەبجە
ئاسمانی راچڵەکاند
خوا تف و لەعنەتی لە سیمای زەوی کرد
موویەک لە لاشەی ئەم دەعبایە نەبزووت

دنیای کەڕ هاواری پێنج هەزار پەپوولەی
دیلی نێو دۆزەخی شەیتانی هەر نەبیست
لە مێژوو بپرسن
نەورۆزی کام وڵات
ئاوری بە کۆگای قژی خاو
برژانگی چاوی جوان
کاکۆڵ و پەرچەمی منداڵی ساوایە!
ئەمە نە ئاکامی ئاکاری خۆمانە و
نە دەستی چارەنووس
یاسای دەستکردی بەدخواکانی زەوینە.
لە ئاسمان بپرسن
زەوینی پڕ تاوان
بەستێنی جەولانی کام خوایە
هەڵەبجە
هاواری ئینسانە
ئینسانی بێ پەنا و تەنیای ئەم زەمانە
وەک ڕەوە ئاسکێکە، بێ داڵدە
لە هەموو لایەکەوە دەستڕێژی لێ ئەکەن
بۆ هەر لا ڕوو دەکا هەر تەڵە و هەر داوە
هەڵەبجە، شکاتی گەلێکە
وڵات بە وڵات و شار بە شار دەیگێڕم
نازانم لە کامە دادگای عادڵدا، وەک تفێک
تەژی لە نەفرەت و ڕق و قین
هەڵیداوێمە نێو چاوانی ئەم قەڕنە بەدناوە

## دوو تابلۆی ژیان

-١-

چاوەڕوانین!
هەموو کاتەکانی ژینمان
چاوەڕانی ڕووداوێکین
ڕووداوەکان ڕوو دەدەن و
ئێمە هەروا چاوەڕوانین
لەدایک بوون، ڕووداوێکە
مردن، ڕووداوێکی دیکە
ژین مەترسی نێوان ئەو دوو ڕووداوەیە

-٢-

ژیان، خاچێکی گرانە
من، وەک عیسا
بەرەو گردی یاخی بوونم
کێشی دەکەم
یان گاشەبەردی تاوانە
من وەک سیزیف
لە بناری منداڵییەوە
هەتا لووتکەی مەرگی دەبەم
هەرچەند بارم زۆر گرانە و
هەزار ساڵە
ئەم هەورازە تووشە دەبڕم
بەلام شادم
کە سەرئەنجام

لە جولجوتای عیشقا دەمرم

سالی ٧٧

**کوودەتا**

جادە پشتی چەماندەوە
سیگنالی ئەژدیهای سەفەر
نالاندی و تەنیاییمی لاواندەوە
دەستی هانی خۆشەویستم
دەستی گرتم
وتی پێمدە یادگاریێ
دەستم نایە سەری سینگم:
نەمداوە پێت مەگەر گولم؟
وتی کوانێ
وتم دلم.
وتی ئەوە دەیان سالە لەلام دایە
وتم هانێ گیانیش لەگەل خۆتا ببە.
گیانم بوو بە سێ بالندەی لانەی ئەوین
لەگەل دلدارا هەلفرین.
ئاخ!
گەر بۆم بلوێ
لەسەر نەخشەی ولاتەکان
هەموو جادە و شەقامەکان دەسرمەوە
ئیزنی کۆچ و سەفەر نادەم
ئەم یاسایە دلتەزینە
بە کوودەتای ئەوینداران

لە جیهانا دەبڕمەوە.

١٣٦٥/٣

**شیعری تازە**

کوڕەکانی هۆلاکۆخان
کاتێ بەسەر شیعرەکانما
نەوتیان پژان
بوو بە جێژنی وشە کوژان
ماری قامچی دەمی نابووە کانی خوێنم
کەڵبەی کەڵەبچە وەک چەقەڵ
دەستی هونەرمی، ئەکرۆژا
شقارتەیان داگیرساند و
بوو بە قاقا و چەپڵەڕێزان
هاوارم کرد:
من شاعیری چەوساوانم
هەزار کوانووی پڕ لە ئاگر
شیعرەکانم ناسووتێنێ
گۆمی گەندەڵ کەی ئەتوانێ
چیای هاوار لە ناو خۆیا بخنکێنێ
هەر لەو کاتا شیعرەکانم
لە ناو گڕدا هەڵئەقرچان
دەستی مێشکم
لە ناو هێلی توورەی دڵما
وشەی شیعری تازەی ئەچان.

ساڵی ٦٠

**هەتا لووتکە چەندی ماوە؟**

دانامرکێ
هەتا دێ هەر زیاد ئەکا
گڕو گڵپەی ڕۆحی یاخی بووی ئەشقیام
رامەوەستە، بڕۆ لەلام
با تاوانی من تۆش نەگرێ
کەوتوومە بەر تووکە شەقی چارەنووس و
وەک گۆیەکی سەرگەردانی گۆڕەپانی نەفرەتی خوام
ژیانم لێ وەڕەز بووە
زەوی لەژێر گرانی لەشما ئەناڵێنێ
چاوی ڕۆژ لە حاندی سیمای من هەڵنایێ
من چۆلەکەی باڵشکاوی وەرزی ڕەشی گەردەلوولم
ڕۆحم لەگەڵ ئارامشدا،
لە زەوی تا ئاسمان دوورە
دڵم پڕە لە هاوار و گوێچکەی گەردوون
لە بەرامبەر پاڕانەوەم کپ و کەڕە
لێم نابیسێ سکاڵایێ
ئاسمانی من نزم و نەوی
هەورێکی ڕەش سەر تا پامی داپۆشیوە
ئاسۆ تا ئاسۆ تاریکە
تەنیا ڕێگەی بەرهەنگاوم
لە خۆمەوە دەست پێدەکا و
دەگا بە هەڵدێری ڕۆحم
چ ئاستەنگێکی باریکە

ئاسۆ تا ئاسۆ تاریکە
باران، باران، بارانی رەش
یاغر یاغر دەبارێت و تەرم دەکا و نامشواتەوە
لە ناو تۆف و کرێوەی وەرزی شەختەبەندی تەمەندا
رەق هەلاتووم
بۆ کوێ دەرۆم؟
نازانم لە کوێوە هاتووم!
شێرە بەفرینەی دەستکردی مندالانی چارەنووسم
رۆژ وەک ئەژدیهای ئەفسانە
لووشم دەکا و دەمخواتەوە
هەتا لووتکە چەندی ماوە؟
ئەی خوا گەورە و بچووکەکانی سەردەمی ویژدان تۆپیو
«جولجوتا»ی من لەسەر دوندی کام کوێستانە
بە ئەندازەی هەزار عیسای ناسری لە خاچ دراوم
یەهووداکان لەو دیو پەرچینی ماچەوە
بە ساکاری رۆحی ماندووم گاڵتە ئەکەن
ئەی خوا گەورە و بچووکەکانی سەردەمی ویژدان تۆپیو
هەتا لووتکە چەندی ماوە؟
مەهێلن، مە...
ئەمجارە کە گەیشتمە لووتکە
بەردی گیانم بەربێتەوە
من نامەوێ ئەم زەوینە پڕ تاوانە لە ژێر پێما بخولێتەوە
ئاخر مەگەر نازانن من
سالگارێکە گاشە بەردەکەی «سیزیف»م لە کۆڵ ناوە؟

هه‌تا لووتكه چه‌ندی ماوه؟
راسته، من بووم له ئاگردانه‌كه‌ی ئێوه
ئاورم دزی بۆ مرۆڤ و
له مه‌شغه‌ڵدانی رۆحی خۆم
تیشك و رووناكیم دابه‌ش كرد
گوناهم كرد
بۆیه ئێستا له تاراوگه‌ی هه‌ڵه‌مووتم
ئاوره‌كه‌یان به‌ردایه‌وه له گیانی خۆم
ته‌ماشا كه‌ن، چۆن ئه‌سووتم؟
رزگارم كه‌ن
له چوارمێخه‌یان كێشاوم
هه‌موو شه‌وێ به ژاری ژین
ده‌شتی گیانم ئاژین ئه‌كه‌ن
ئه‌م مۆته‌كه سواری رۆحی ماندووم بووه و دانابه‌زێ
ئاسمان بێزوو به خوێن ئه‌كا
هه‌ر داڵ ئه‌زێ!
هه‌ر داڵ دێن و جه‌رگم ده‌خۆن
ئه‌م ئاسمانه هه‌ر داڵ ئه‌زێ!
هه‌ر داڵ ئه‌زێ!
ئاخۆ گوڵی شۆرانی له كام كوێستانه؟
كوێستان نه‌ما به‌رد به به‌ردی
به خوێنی خۆم نه‌شۆرمه‌وه
هه‌ر ده‌ڕوم و ناگه‌م به ئه‌م ناونیشانه‌ی
«شۆڕه خه‌زاڵ» بۆی داناوم

هەر ئەڕۆم و زام لەسەر زام
لەسەر سینگ و دڵم دەڕوا
گوڵی هەزار هەزار عەزرەت
لە کوێستانی دڵما پشکووت
ڕێگەی گەڕانەوەش نییە
پردەکانی پشتی سەرم گشت رووخاون
هەوارەکەی «خاتووخەزاڵ»یشیان کردە قەرەبرووت.
هەتا لووتکە چەندی ماوە؟
ئەی خوا گەورە و بچووکەکانی سەردەمی ویژدان تۆپیو
هەتا لووتکە چەندی ماوە؟
ئەی من تا ئێستا چۆن ماوم؟

ورمێ- ١٣٧٢

**داستانی دارەپیرە** ........................................................................................

هەبوو نەبوو ساڵانی زوو
لەسەر یاڵی بەرزی مێژوو
پیرەدارێک بە ساڵا چوو، ڕاوەستا بوو
سەری نابووە کۆشی خەیاڵ
بیری لە ژین ئەکردەوە
دەنگ و چریکەی باڵندەکان
لە ئامێز و لە نێو شاخ و پەل و پۆیدا،
تاڵی ژینی لە یادی ئەو ئەبردەوە
قژ و کەزی شانە ئەکرد دەستی شەماڵ
بە قەتار و سیاچەمانە
بە حەیران و لۆرە و هۆرە و بە گاڵەگاڵ

***

دارەپیرە بەر لە مێژوو
لە نێو ئەم خاکە روا بوو
دارە پیرە ریشەی ژینی
تا نێو دڵی گابۆر و ماسیی کوتابوو
دارەپیرە سەد قۆناغی دیبوو بە چاو
باروبنەی سەد کاروانی راپێچا بوو
دارەپیرە، زریان و شەختە و رەشەبای
سەدان کەڕەت بەزاندبوو
دارەپیرە وەک ئێشکچی دەشتی سووتاو
لەسەر لووتکەی قەڵاکەی خۆی راوەستابوو
دەستی سووتاو
گەوای شەڕ و تێکهەڵچوونی سەدان جاری
دار و زستانی ملهوڕ بوو
ئەوەی پاشەکشێ ئەکرد
هەر زستانی گژ و دڕ بوو
وەرزێکی تاڵ
رۆژێکی رەش
دارەپیرە، سەری نابووە کۆشی خەیاڵ
با لاپەڕەی گەڵاکانی
وەک کتێبی کۆنی مێژوو ئەدا لاوە
رووداوانی یەکە یەکە
بە گوێی دەشتا ئەخوێندەوە
ورەی دەشتی

لە نێو خوێنی ڕووداوانا ئەژوێندەوە

***

فەرمان درا، فەرمان درا
دارەپیرە بقلیشێنن
کۆتەی ئەنجن ئەنجن کەن و
بۆ زستانی سۆبەی کۆشکی فەرمانڕەوا
ڕەگ و ڕیشەی دەربهێنن.
فەرمان درا، لەبەر ئەوەی
دارەپیرە پەنای یاخی و جەردەکانە
لەبەر ئەوەی سێبەری وی
مۆلگەی گەلاڵە و پیلانە
لەبەر ئەوەی هێندێ باڵندەی نافەرمان
کردوویانە بە هێلانە
پاڵ و پسێو دارەپیرە
مەتەرێزی یاخیەکانە
بیقلیشێنن، هەڵیپاچن
چیلکەی کەن و
بە سێدارەی یاخی بوونیا هەڵیواسن

***

داس و کوتک و تەور هاتن
لە سێبەری دارەپیرە
- ئیستێکیان کرد-
چاویان گێڕا
دارەپیرە، وەک بەردی ڕەق،

خۆی بۆ زەبری داس و کوتک و تەور و چیتر ئامادە کرد
خێڵی دوژمن،
بە هەڕەشە و گەلەکۆمە
هورووژمیان بۆ دارە برد
دارەپیرە، گوێی نەلەقان
تەنانەت چاوی نەنووقان
قووڵتر لە جاران دەماری
بە نێو ناخی خاکا چەقان
خێڵی دوژمن، ماندوو بوون و
لە سێبەری دارەپیرە راکشان و
کەوتنە راوێژ و تەگبیران
گەورەکەیان وتی یاران:
وەک کورد ئەڵێ داری پوازی لە خۆی نەبێ قەد ناقڵیشێ
بیروڕاتان کۆ کەنەوە، ناشێ نەبێ
پوازێ لە خۆی پەیدا کەین و دایتاشین و
ئیتر ئێوە کارتان نەبێ

***

کەوتنە گەڕان
ئەملا گەڕان، ئەولا گەڕان
لە ئەنجاما، بەرچاویان کەوت
لقێ سووتاو
رەق و تەق و رەنگ بزرکاو
لار و گیڕ و لەبەر خۆرەتاو هەڵقرچاو
لاواز و بێ بەر و گەڵا

خوێڕی، ناحەز و بەرەڵلا
وتیان: خۆیە
دیارە دەبێ بە ئارەزووە هەڵیقلاشین
بەو جۆرە وا مەبەستمانە
بۆ گیان ئەم ئارە دایتاشین
لقیان بڕی.
لقی لار و خوارو خێچ و بێ ئەمەکیان
بە بەڵینی درۆ کڕی
دایانتاشی،
تیژیان کرد و
بوو بە پواز
وتیان پێی چۆن خەیانەت کا
هۆرە کەوتە بەردەمیان و
پیرەدارەیان گەمارۆ دا.
دارەپیرە هەناسەی ساردی هەڵکێشا
وتی: لقە مەڕۆ مەبە بە دارەدەست
قەیناکا هەر ماوەت ماوە
باوەشی من هێشتا بۆ تۆ ئاوەڵایە
لەگەڵما بە لە بەرامبەر ئەم بەلایە
مەڕۆ لقە! جێم مەهێڵە
دەستی سەوزی باوانی خۆت
بە ئاموور و نیزی بێگانە مەکێڵە
بەڵام هۆرەی ویژدان تۆپیو
پووزەی تیژی نا سەرسینگی دارەپیرە

ئەمجارە دار وتی: پواز!
وەرگەڕێوە بۆ خۆت ئەڵێم
من نامرم
لە ئەوپەڕی مەرگیشەوە هەر دێمەوە
مێژوو حوکمت لەسەر ئەدا
دوژمن خاکی خەیانەتت بەسەر ئەکا
فریو مەخۆ، داوی نەیار بپچڕێنە
تف لە سیمای عەرنەمووت کە
هەڵبڕووسکە و چاوی دوژمن قاڵاوپووت کە
پواز وتی:
ئیتر من ئەو لقە لەڕ و لاوازە نیم
تەماشام کە، بزانە چیم
ڕێزم ئەگرن، قەدرم هەیە
جامەی ڕەنگین بۆ سەرتاپای باڵام ئەبڕن
بەڵێن وایە بمکەن بە دەستەی خەنجەری
بەر پشتوێنی فەرمانڕەوا
من چیم داوە لە یاخی بوون
نازانم لە خەبات دژی سەرما و سۆڵە و
مافی ڕەوا
ئیتر پارە و پاروو لە لام هەر وەک کایە
زگم تێرە و جامەی زێڕین لەبەر ئەکەم
قەت نەمدیوی، نایشتناسم
ڕەگەز چیە، باوان کامە
زێد و وڵات لەلام بایە

خۆ وەحشی نیم-ئێوە مانان-
لە ئەم یاڵ و دوند و چیایە
تەماشاکە، چەند لووس و جوان و شەنگم
چەندە تیژم
کێ ئەزانێ من ئەو لقە هەڵقرچاوەم
هەلی وا قەت دەست ناکەوێ
لەسەر فەرمان دەتکوژم و
داخم بە سەرتا ئەڕێژم

***

پوازی نەیار وەک سەگی هار
قەپی کردە ناقی دارا
خێرا هاتن، داریان دا بەر
دارەپیرە لە نێو خوێنا
ئەم وشانەی هاتە زارا
من نامرم... لەناو خوێنا ئەژێمەوە
وەک چووزەرە و چرۆ لەسەر کۆتەی خۆما دەڕوێمەوە.
دارەکەیان بنبڕ کرد و
بۆ ئاگری کوورەی کۆشکی سوڵتانیان برد.
ڕێ کەوتن و پواز وتی: ئەی من نابەن؟
گەورەکەیان وتی: لاچۆ!
لاچۆ لەبەر چاوم بۆگەن!
قەت نەمدیوە خاین بە خۆ
بێژگە هۆرەی سپلە وەک تۆ
تفی لێکرد.

بە شەپان و بە تێهەڵدان
فڕێی دایە نێو زبڵدان.

***

ئەوان چوون و
دوای شینگێڕی دارەپیرە
مقۆمقۆ کەوتە چیا
باڵندەکان، هەواڵێکیان بۆ یەک ئەبرد
پیرۆزبایی سەرکەوتنیان لە یەک ئەکرد
وتم چیە؟ چی قەوماوە؟
لە دوای مەرگی دارەپیرە
جگە خوێن و ئەشک و ماتەم
چیمان ماوە؟
وتیان: نابێ بیدرکێنین
نهێنی و ڕەمز و ڕازە
دەبێ بە چاو خۆت ببینی.
کاتێ چوومە سەر مەزاری دارەپیرە
بە چاوی خۆم ئەوەم بینی
گۆپکە و چووزەی چەتری تازە.

١٣٦٧/٢/٩

# فەرهاد شاکەلی

سالی ١٩٥١ لە گوندی شاکەلی ناوچەی گەرمیان چاوی بە سەر دونیا کردۆتەوە. لە ٢٢ سالاندا یەکەم بەرهەمی خۆی (پرۆژەی کوودەتایەکی نهێنی) بلاو دەکاتەوە. پاش ئەوە شەش دیوان و کۆمەلێک کورتە چیرۆک و چەند لێکۆلینەوەیەکی زانستی و چەند وەرگێرانێک لە چاپ دەدا. لە ١٩٧٩وە نیشتەجێی ولاتی سوێدەو لە زانکۆی ئۆپسالا ماموستایە. لە ١٩٧٩ ژیانی هاوبەشی پێک هێناوەو بابی سێ مندالە.

بەرهەمەکانی بە زمانانی ئینگلیزی، عەرەبی، فارسی، تورکی، ئیتالیایی، نۆرویژی، ئیسلاندی و فەرانسی وەرگێردراون.

## سێ دەنگ لە مێژووەوە

-١-

لەسەر گلێنەی چاوەکان
دیواری کۆشک دامەزراوەە،
وەک نەخشێکی ئێجگار گران
کەللەسەرێک هەڵوەسراوە.
نووزە و گریان
فرمێسک و داخی نهێنی گیای بەهارە
تاریکایی خزاوەتە کۆشی هیوا
لە ناکاوێ
کوورەی ئاگر کۆشک و دیوار وێران ئەکا،
گلێنەی چاو دیمەنی ژیان ئەخواتەوە.
چەکوش ئاوی تینوێتییە.

-٢-

بیابانی دوڕگەی عەرەب
گەرد و لمی ئاگرینی
ئەڕێژێتە شاخ و دەشتی وڵاتەکان
شەقامەکان داپۆشراون.
بو دامەزراندنی مزگەوت
بەرد و داری
شاخەکانیان کرد بە دیوار.
لمی دوڕگەی عەرەبیان کرد
بە مرواری.
گلێنەی چاو دیلی تەمی بیابانە.

تاوانێکی نالەبارە
شەقامی خۆر لەیاد بچێ.

-٣-

ئاسۆ دیار بوو کە سوارەکان بە تاو هاتن
ئالای رۆژیان هەڵگرتبوو
روخساری پڕ لە توورەیی سپارتاکۆس
چاوی سیزیف،
لە رووومەتیانا دەرئەکەوت.
لە ژێر گەرد و تۆزی چڕی
سمی ولاخەکانیانا
ئاسۆ لە چاو ون بوو، نەما.
لە بیریان چوو:
وشەی نهێنی دابنێن،
چەکوش، چرا لەگەڵ خۆیانا هەڵگرن.

## چەند برگەیەکی پرۆژەکە

-١-

لە رووومەتی ئاوێنەدا
هەنگاوەکانمان ئەبینرێن
نوقمی قوڕن،
پەلەقاژەی رزگاربوونیان چیرۆکێکە
بۆ منداڵان ئەیلێیینەوە.
لە رووومەتی ئاوێنەدا
چاومان نییە، ئەکەوینە ناو چلپاوی

دڕک و داڵ و ئاگری رۆژی تەماوی

-٢-

مانگ بکەینە وشەی جوانی گۆرانیمان،
ئەستێرەکان بە ملوانکەی تریفەدا بۆ دەسگیران،
ئەوسا گڕی ئارەزوومان
پشوو ئەدا، ئارام ئەگرێ
لە باوەشی پڕ لە تامی ژیندا ئەمرێ.

-٣-

زەنگی بارگەی شەوی کۆچمان
ناگاتە گوێی کچۆڵەکان،
لەناو نوێنی دڕکاویدا
هێشتا خەوتوون.
ئامادە نین بۆ هەڵپەڕین،
بۆ پێکەنین.
کاتێ ئەچین
کە مەمکیان، گۆنا و دەمیان، تێر هەڵمژین،
حەزی هەزارساڵەی تەمەن
لە یەکەم ماچا بڕێژین.

-٤-

شەقامەکان تاریکایی دایپۆشیون،
ئەشکەوتی قووڵ هەڵواسراوە لە ڕێگادا.
بزماری ژێر هەنگاوەکان هێزی چەکوش
لایان ئەبا.
لە کاتێکا

بەسەر شەقامی رووناکا
هەنگاو ئەنێین،
لاشەمان وا ماندوو ئەبێ
لەناو گڕی ئاگری تووڕەییماندا
نێرگس و شەوبۆ دەرئەچێ

-٥-

گەردەلوول و گڕی تەمەن بە شەقاما
بچێ، باوەش ئەکا بە گوڵۆ بە نەماما

شاکەل ١٤-٢-١٩٧١

**ریژەن**

پرسیار لە کێ بکەم؟
بۆ نازانی لەم کاروانسەرایەدا
تاریکایی سێبەری تۆیە
دەتکەمە مۆم و دووراودوور سەرنجت دەدەم؟
بۆچیم ناخوێنیتەوە،
پریشکێ،
گەردوون لە دڵما دەسووتێنێ و
دەمکاتە کێوی تیشک

سۆڵلەنتوونا ١٩٨٥/١/٢٢

**سەردەمی رۆژ بە ریوەیە**

لە سەردەمی جەنجاڵی ئەتۆم و ئەوینی درۆ و ناپاکیدا
نەوەی شۆڕش و راپەڕینم و
هەڵدەکوتمە سەر دڵخۆشیی گەوجانەت،
سەر بیرەوەری بە ساڵاچووی نێو زیندانت و

یەکەم مزگێنیت بۆ دێنم
وەرزی باران بەڕێوەیە،
وا ڕۆژی سەردەمێکی نوێ هەڵدێ و
شاری خەم و تاسە و برین
کاتێ دەستەی دڵدارەکان
لە دەروازەی سەردەمی ڕۆژ وە ژوور دەکەون
تۆ ببە بە دیمانە و
تۆ ببەرە سەرکاروان.
ولاتەکەم! تۆ هەر تاکە ولاتێکی،
چ تۆ لە منەوە دوور بیت و
چ من لە تۆوە
هەردە و تەلانی ئەم سەرزەمینە پڕ دەبن
لە ژانی خۆڵەمێشین،
لە مەرگ و لە خەمی شین.
لەو دەمەیدا گورزی ناپیاوی دەوەشێنن
لەو دەمەیدا بەر دەبنە گیانی هەتاوی هەڵهاتووی
نێو چاوانت
هەزاران کۆنە سالی کینەی چینایەتی و شێتی
لێم دەئاڵێن و دەمگروون.
نە سواری کەشتی وێڵ و سەرگەردان دەبم و
نە دەچمە نێو
خۆپێشاندانی سەلار و بێمزەڕەت
با هەموو ڕۆژێ
بدەن بەسەر ماڵەکەما

با بە قۆناخەتفەنگ.
دەرگەکان هەلاهەلا کەن و
بکەونە پشکنینی کۆڵ و بوخچە و جانتاکانم
خۆ من نامەوێ
سەرسەلامەت بم،
با بزانن لە خۆپیشاندانی زریان و رەشەبائاساییدا
بەشداریم کردووە.
با بڕیاری مردنم بدەن
لەسەر ئەوەی
ڕێگەی مەڵبەندی ڕۆژم گرتە بەر.

شام ١٩٧٦/٨/٢٩

**بۆنی باران**

با بێ دەنگی پڕ ئاوازت، با دەنگت بێ،
با هەناسەت لە دووەرە مێشکی ماندووم
سەرخۆش بکات،
با بە ئاستەم بکرێتەوە گوڵهەناری دەم و لێوت.
با بێ دەنگت
بەسەر هەستی مات و خەمباری ئەمشەوما
نەرمەبارانی دڵداری
ببارێنە.
با بێ دەنگت.
خۆ من بێ تۆ
دەرگەی هۆنراوەی شیرینم بۆ قەنابێ.
بێ تۆ باژێڕ

لەم كۆلان و لەو شەقامە
لاوكی ژینم راوەنێ.
بێ تۆ گۆرانی ئەڤین،
بێ تۆ ئاوازی خەمرەڤین،
چێ نابێ.
رۆژم بێ تۆ –گیانە!- رۆژی دارستانێكی پاییزە،
بێ پێكەنین و بێ بزە.
شەوم بێ تۆ
شەوی دووریی نیشتمانە و
شەوی یادی مەرگی هاورێی بێناونیشان،
كەسێ نییە هاودەمی بێ،
كەسێ نییە برینەكانی بژمێرێ،
كەسێ نییە
لەتەک دلی سەرشێتیدا بەستە بلێ،
پێبكەنێ.
شەوی دلداریكە تەنێ،
هەرچی مەرگی سەرزەوییە
وەكوو پۆلیس
راوی دەنێن و نایگەنێ.
شەوی دلدارێكە تەنێ،
بێشكەی خەونی برینداری رادژەنێ.
كەسێ نییە هاودەردی بێ،
كەسێ نییە هاودەمی بێ،
كەسێ نییە هاوخەمی بێ

کێ بێ بێ تۆ، برینی هۆنراوەکانم
دەرمان بکات؟
کێ بێ دەرد و ژانی دڵم
هاسان بکات؟
کێ بێ لە پەنجەرەی نیگای سەرهەڵگرتووم
گەردی خەمی سالان بسڕێ
کێ بێ جارێ
پیرەداری ئەم دڵەی من راوەشێنێ،
هێشووی برین بێتە خوارێ
کێ بێ جارێ
قۆزاخەی خەونەکانی من بکاتەوە،
سەری کووپەی یادەکانم هەڵداتەوە

**هەورێکی کەڵەگەت**

من گوڵێکی سوورم دەوێ
بۆنی زۆزانم بۆ بێنێ
من هەورێکی کەڵەگەتم دەوێ بێت و
دار و بەرد و دەشت و زنار
بە دەستێوە بناڵێنێ
چەخمایەک
لە شەوگاری زڤستانی تەنهاییما
بشریخێنێ.

سۆلێنا ١٩٧٩

## مارف ئاغایی

لـە ٢ی ڕیبەنـدانی ١٩٦٦دا لـە گونـدی «وەزنـێ»ی ناوچـەی سندووسی سـەربە شاری نەغەدە لە دایک بووە.

خوێندنی سەرەتایی‌و ناوەندی لە شاری نەغـەدە تەواو کردووە. بە هۆی پشێویەک کە لە نەغەدە داکەوتبوو، دەگەڵ بنەماڵەکەی بار دەکەن بۆ شاری شنۆو لـەوێش ساڵـێک دەیخینـە حەبسەوە.

لە ١٩٨٥دا لە گەڵ دامەزرانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی سەحەلادینی ئەیووبی و دەرچوونی کۆڤاری سروە، شیعرو پەخشان دەنووسێ و لە سروەدا لە بڵاوی دەکاتەوە.

لە ١٩٨٧دا لە کۆڤاری سروە دەست بە کار دەبێ‌و بە هەموو هێزو گوڕەوە خزمەتی ئەو کۆڤارەو زمان و ئەدەبی کوردی دەکا.

ساڵی ١٩٩٨ بە هۆی کارەساتی ترۆمبیلەوە ماڵئاوایی لە دونیا دەکاو بنەو بارگەی بەرەو دیاری خامۆشان لێک دەنێ.

ئەو بەرهەمانەی کە لە چاپ دراون ئەمانەن:

- وەرگێڕانی کتێبی «هەستی ناسیونالیستی» لە ئینگلیزیەوە.
- ئاسمان دوورو زەوی سەخت. شیعر.

**مانەوە**

ئەم خۆشەویستە دڵڕەقە عیشق پەروەرەی
نەدەتوانم وەکوو کیژێک بیخەمە پاشتەرکی ئەسپ و
لە ژێر سایەی زیڕەوشانی تریفەی مانگەشەوێکدا
هەڵیگرم،
نەدەشتوانم هەرگیز دڵی لێ بەردەم و
خۆم گیرۆدەی کۆلکەزێڕینەی شوێنێکی دیکە بکەم
ناوی: خاکە.
ئەم دەریایەی
نە دەتوانم لە جامی چاوەکانمدا رایگوێزم و
نە دەشتوانم لە دووری ئەو
لە ئۆقیانووسی هیچ شوێنێکی دیکەدا قومە ئاوێک
بخۆمەوە
ناوی: خەڵکە.
من دەزانم دارستانی هەموو شوێنێک
جریوەی گەرمی چۆلەکە و
رووباری هەموو ولاتێک
دەنگی تاڤگە و رەنگی کەف و پێچ و پەنای رێگەی بەرەو
دەریای هەیە
بەلام چ بکەم لێرە نەبێ
نە گوێم چاکیان دەبیسێت و
نە چاوم چاکیان دەبینێ و
نە گیانم چاکیان هەست دەکا.

١٣٧٥

**بەڵێن**

ئەگەر رووبار،
گەڵای تەرمم هەتاکوو نێو دەریا ببا،
من ئامادەی هەڵوەرینم.
ئەگەر ئاسمان،
مەلی رۆحم تا ئەوپەڕی بێ کۆتایی ریگا بدا،
من ئامادەی هەڵفرینم.
من ئامادەی توانەوەم
هەڵمی لەشم دەباوەشیدا راگوێزێ:
ئەگەر هەور.

١٣٧٥

**تەرزە**

له مەرگەساتی نیوانی دوو رووداوی له دایکبوون و مردندا ژیان کەپری
ژێر تەرزەیەکی ناوەختە و منیش نەوەی بێ ئاگری زەرتەشتی پیر.

هیچ کەس نیە بڕوا بکا
ئەم مەشغەڵە بێ ئاگرە سەراوەژوو هەڵواسراوە،
رۆژێک گڕکانی ئاگر و
ئەم خۆڵەمێشە رەشپۆشەی
وا خەریکە کفنی بەفر غەمناکانە دایدەپۆشێ
رۆژێک سەکۆی سەمای کچی ئاور بووە.
لە تەنیایی بەربەرین و بێ بڕانەوەی رۆحی خۆمدا
دەتلێمەوە،
هیچ کەس نییە خەونەکانم بڕوا بکا و

من دەترسێم با و بۆران
شانازی سەر کێلەقەبری پێشینانمان بسڕنەوە

١٣٧٥

### کۆچ

خاک،
توانای کۆچی نییە.
ئەوەیە رازی مانەوەی هەمیشەی من
لەم‌وڵاتەدا.
من و تۆ
زەوی سەرسەوز و ئاسمانی ساف
وە تۆ سەرخۆش
لە نێوان ئەرز و ئاسماندا.
«زەوی سەخت، ئاسمانیش دوور»
وە من ماندوو
لە نێوان بەرد و باراندا.

١٣٧٤

### سەرگەردان

دیتنەوەت چ سەختە
تەنانەت ئەو دەمەی پێکەوەین.
ون بوونت چ دژوار،
تەنانەت ئەو دەمەی لێک دوورین.

### ئەزموون

تەنیا یەک جار

هەڵفڕین تەجرەبە دەکرێ
گەڵا
لە پاییزدا
لە لکەوە هەتا زەوی
ئەمنیش تەنیا یەک جار ژیان
لە گریانی کاتی لە دایک بوونەوە
تا فرمێسکی دەمی گیاندان

**بیر** ................................................................................................

دارتاش داری قەفەسێکی دادەتاشی،
راوچییەک داوی دەتەنی،
شاعیرێکیش بە دەم بیری
شکانی شوولی قەفەسێک،
پسانی رایەڵی داوێک،
هەڵفڕینی باڵندەیەک،
دەتلایەوە.

١٣٧٢

**چەند کۆپلە شیعری سەربەخۆ** ...................................................................

-١-

لێوم پەنجەی باغەوانێک، چاوەڕوانە
لەرەی ماچێ
لە داری بەژنی تۆبچنێ.

-٢-

هەوری یادت

به سەر داربەڕووی باڵاما ڕادەبووری.
ناتوانم دەست لە دەستت نێم،
بریا هەور دەستی بوایە.

-٣-

من بەروبووی داری گریان،
تۆ ڕێبواری نێو باغی سەوزی پێکەنین.
چەند زەحمەتە بە یەک گەیین

-٤-

سینگی هەور
کاغەزی زۆر نامەی من بوو.
بۆ پەژارەم:
هەور گریا،
کاغەز بە دەستت نەگەیی!

١٣٧٢

**خۆزگە**

لەم سنوورانە قەڵسم
گشت لایان لێ تەنیوم.
خۆزگە توانیبام لە نێو
جیهانی بێ سنووری چاوانی تۆدا بژیم.

١٣٧١

**بەهار**

ئەی خونچەی دەمت
تاقانە خونچە:
لە پاییزیشا شکۆفە دەکا.

ئەی گوڵی کوڵمت
تاقانە گوڵێک:
لە زستانیشا
سووری شەڕابی.
ئێستا چ وەرزە؟
لێم نادیارە
هەر کات کە خونچەی دەمی تۆ پشکووت
بۆ من بەهارە

١٣٧٠

**خۆشەویستی**

ئاسمان بە قەد من
ئەستێرەکانی خۆش ویستبایە
هیچ ئەستێرەیەک
دانەدەڕژا.
زەریا بە قەد من
ماسییەکانی خۆش ویستبایە
هەرگیز دەنووکی ماسیگرەکان
نەدەبووە تابووت.
چیا بە قەد من
بەفری خۆش ویستبا
یا هەر چوار وەرزان بەفری دەماوە
یا خۆیشی لەگەڵ ئەوا دەتواوە.
بەڵام داخەکەم
ئاواتم: ئاسمان، زەریا و چیایە

خۆیشم: ئەستێرە و ماسی و بەفرم.

١٣٧٠

**گلکۆ**

مەرگی شەهید
وەکوو مەرگی خۆرەتاوە.
دەمەو ئێوارێکی درەنگ
کە پنجەی چلکنی هەور
خوێنی هەتاوی لێ دەتکا
تەرمی لە خوێن گەوزاوی خۆر
بۆ باوەشی گلکۆ دەخووشێ.
بەربەیانی
لەسەر کێلی رۆژهەلاتی ئەم گلکۆیە
هەر دڵۆپێک
دەبێتە پەیکی گزینگ و تاریکایی دەشواتەوە.
مەرگی شەهید
وەکوو مەرگی خۆرەتاوە.

١٣٦٩

**شۆڕەبی**

رووبارێک بوو سالیانی ساڵ لە ئاوێنەی روخسارێک
بسکی شۆڕەبییەکی دەشوشت.
رۆژێک رووبار لە شۆڕەبی بە رقدا چوو
تووڕەییەکەی بوو بە لێلاوێکی سوور و
رەنگی سەوزی بسکەکانی لە خۆی هالاند.
کە شۆڕەبی پرسیاری کرد:

بۆ لێم تووڕەی
وتی کاتێ قەمچییەکەی ڕەشەبای دڕ
لە بەژنی دارستان هاڵا
تۆلە ترسا
بە سەرشۆڕی دۆش دامابووی.
کە ئەمەی وت گەردەلوولێک هەڵیکرد و
شۆڕەبییەکە خۆی وێک هێنا
لە نەکاوێ
وەک دەروێشێکی جەزم بوو
پرچی بەسەر شانیدا لادا
ڕووبارەکە کەوتە لەرزە:
کاتێ دیتی کە نێو دڵی شوڕەبییەکە
لانی شێرێکی سەربەرزە.

١٣٦٨

## نەبەرد جاف

ساڵی ۱۹٤۷ لەو کاتەی کە تازە دونیا وەیشوومەی فاشیزمی لە سەر تێپەڕیبوو، لە شارۆچکە خنجیلانەکەی کەلار چاوی بە سەر دونیای پڕ لە کارەساتدا کردەوە. لە ۱۹٦۷دا کولێژی سەربازی تەواو دەکات. پاشان لە تاران خوێندنی زمانی ئینگلیزی و ئەدەبی فارسی دەست پێدەکات، تا ۱۹۷۲ کە کولێژی زمانی ئینگلیزی و ئەدەبی فارسیش تەواو دەکات.

نەبەردیش وەکوو هەموو کوردێکی نیشتمانپەروەر ناتوانێ چاوی بە سەر ئەو هەموو زوڵم و زۆرەدا بنووقێنێ؛ بۆیە ڕێگای خەبات دەگرێتە بەر و لە ۱۹۸۷دا دەڕواتە ریزی پێشمەرگەی کوردستانەوە.

نەبەردجاف لە ڕۆژنامەکانی «کەیهان» چاپی لەندن و «ماموستای کورد» چاپی سویدو گۆڤاری «کاروان»دا بەرهەمی بلاو کردۆتەوە.

**بەغا**

ئەمشەو لە باخەڵتا ئەنووم
بە مەمکی ئەم بەرەو بەری
ئاوی دیجلەی کاس و مەنگا
رەنجی ژیانی خۆم ئەهەونووم

***

ڕێبوارێکم
تاقە شەوێک مێوانێکم
دڵ بە تەمای خوانێکی تۆ و
بەرەڵلایی و بەردانێکم
نەکەی باسی رەنج و دەردی
حەڵلاج بکەیت
روو و روخسارت لێم تەهەل کەیت

***

بەغای بەغا
ساقیەکانت گەر بزانن
چەن تامەزرۆی
قومێ مەی و شێت و ویتی و
چاوی رەش و
بەزم و رەزم و لێوانێکم
هەرگیز دلی شەکەتی رێم
ناتورێنن
دەبنە پیاڵەو خوم و شەراب
هەتا سەحەر

ساقی خۆش ڕەوتی باڵانەی
پەیاپەی مەی
تا دوا دڵۆپ
بە گەرووما ئەچۆڕێنن

***

ئەمشەو پەنام هێناوەتە
بەردەم دەرگای
دڵی هەرزەی پڕ لە داوت
تکایەکە و بێ سوودیشە
دادی خەمم بگەیەنە
بەردەم کچی روو تکاوت
تەنیا ئەمشەو داڵدەم بدە
خەم تەیمانی دەور و بەرمە
تاوکی رووی تەن و سەرمە
بەغای هەزار رەنگ و یەک رەنگ
ئەی شۆخ و شەنگ
کچی خرپن
ئەی مەمک قنجی تیتک رەش
ئەی شل و مل
ئەفرۆ دێت وەش
ئەی دەستەمۆی خاوەن تەلار
ئەگریجە لار
ئەی کوورە لەش
داخ و قرپن

***

بەغای هەردوو مەنسووری ژین
بەغای دڵ ڕەق
بەغای پڕ قین
شاری پێ بەند
کڵاو زێڕین
شاری هەزار شەو و یەک شەو
شاری کچی خۆش ڕەوت و ڕەو
ئەمشەو شقلی خەمت نەکەی
بە داستان چاوم کوێرکەی
چاو و دڵم ئازار بدەی
لە جێی باسی خۆر و میهر و
ئاسمانی شین
نەکەی شەوم بکەی بەشین

***

بەغای جادوو
بەغای دوو دوو
ئەمشەو دڵم بە تەمایە
کە شارەزاد
خۆی لە تەل دات
منیش ببمە شارەیاری سەدەی بیستەم
تا بە یەک شەو
هەزار شەوی پڕ لە ڕازت ئامێختەکا
بەسەر سفرەی ئاڵ و سووردا

ڕووت و بێ بەرگ
گوڵم ئارەقین
تەنی داخ و سوور هەڵگەڕاو
بە هەستێکی ئاگری وتین
ئایەختەکا
پێشکەشم کا
تا وەک ئەمشەو
بە دەم نەشئەی شەرابەوە
خەمم بڕوێ و دڵ گەشم کا

***

بەغای دیوانەی شێت و وێت
ئەوا ئەمشەو
کەوتمە سەر ڕێت
شاعیرانی شەو شێتی تۆ
هانیان داوم ڕووت تێ بکەم
وەردی ئەندێشە بکێڵم
هەزار هەوراز
لە پشت سەردا جێ بهێڵم
گەردی ڕێگا بە سەردا کەم
تا وەک ئەمشەو
«ئەبی نەوواس»
شاعیری شەو
بە بێ ترس و سام هەراس
لە میحرابی مەیخانەدا

به دەم پیالەی شەرابەود
بدەوێت و روون کاتەوە
نهێنی شەو
شەوی بەغای بێزار لە خەو
ئەوەی لەسەر خۆ و ئەسپایی
بە گوێی هاروونیدا هێنا
درۆ یان راس
چپەیەک بوو، یان مەتەل بوو؟
وا دایهێنا
کە شا ژنی ئاڵۆزاندو هاویشتە ناو
شەپۆلی دەریای خەم و تاس
چی بوو چپە هەر بەو شەوە
بە فەرمانی زوبەیدە خان
لەبەر ئەو چپە دەرکرا
لە نێو شارا
کۆسی ریسوایی لێ درا
ناوی بە بەد ناوی زڕا

***

ئەبی نەوواس
ئەی جوانکیلە
ئەی پەروردەی پێچ و خەمی
دەربارەکەی بەنی عەباس
ئایا راستە
ئەو داستان و دەنگ و باسە

که تا ئێستاش مێژووی بەغا
لە ئاستیدا مەنگ و کاسە
ئەو شەوەی وا
بەغا بە شمشێر سوور کرا
دیجلە بە خوێن سوور هەڵگەڕا
هۆی ئەوە بوو شەوی هەوەس
دەس لەمل و راز و نیازی
کوڕی بەرمەک و عەباس
ئاشکرا بوو
راست بوو... یاخو... ئەفسانە بوو؟
کە پشتاوپشت دەیلێینەوە
جار جاریکیش دەلێن راسە
هۆی ئەو شەوە
هەر ئەوە بوو کە عەباسە
خۆشکی ئەمیرۆلمۆئمنین.
شەوی مەستی
شەوی هەواو هەوەس رنین
دەستە گوڵێکی سوور و ئاڵ
لە خەفڵەتی هەستی سووردا
لە تاو هێرشی تاودا
دای بە ئاو دا؟

***

## موحەمەد حەمەباقی

ئەندامی کۆڕی زانیاری کوردستانەو سەرانسەری ژیانی تەرخان کردووە بۆ پەرای زمان و ئەدەبی کوردی.

لە زۆر بواری مێژوویی و ئەدەبیدا ئەسپی قەڵەمی تاوداوەو بە راستیش گەلێک سەرکەوتوو بووە. تا ئێستا زۆرتر لە ٢٠ بەرهەمی بە نرخی لە چاپ داوە وەکوو:

- ژوان، ١٩٨٠، دیوانی شیعر.
- گەشتی ریچ بۆ سلێمانی، ١٩٨٤، وەرگێڕان.
- کێشەی کورد، ١٩٨٦، وەرگێڕان.
- گوڵەکانی دۆزەخ، شیعر.
- دیوانی ئەدەب، کۆکردنەوەو ئامادە کردن.
- شۆڕشی شێخ سەعیدی پیران و زۆر بابەتی بە نرخی تر

## هەنسکی شیعر

-١-

کە زستان دێت، دڵم ئەگووشرێ
چونکە پەنجەرەکانتان تەم ئەیانگرێ،
لەو دیویشەوە پەردە دائەدەنەوە
ئیتر لە پەنجەرەشەوە ناتبینم

-٢-

روومەتە سپیەکانت،
لە هەتاوی بەیانیانی نیسان ئەچن،
بەڵام تۆ و هەتاو
هیچتان بە چنگ ناگیرێن

-٣-

کێ ئەڵێ تۆ، لە خوێنما نیت
ئەی بۆ کە لە نزیکەوە ئەتبینم:
دڵم ئەکەوێتە پەلە پەل
کە لێشم دوور ئەکەوێتەوە،
دڵم هێواش، هێواش، لێ ئەدا،
خەریکە بوەستێ

-٤-

تۆ بڕوا ئەکەیت پیرەمەگروون
پێ بگرێ و
ئەم نیشتمانە جێ بهێڵێ؟
ئەی تۆ، چۆن جێم ئەهێڵیت؟

-٥-

تۆ هەر بیر لەوە ئەکەیتەوە
چۆن یەکتریمان خۆش بویێ؟
بەلام گیانە، بیرت نەچێ
خۆشەویستی، هیچ یاسایەک نایگرێتەوە

-٦-

هەموو شەوێ، گوڵە کێویلەکان،
لە شیعرەکانما ئەخەون
بۆیە ئەوەی شیعرەکانم ئەخوێنێتەوە،
پێم ئەڵێ: بۆنی ژوانیان لێ دێت

-٧-

هێشتا شێوە شیرینەکەت،
تۆسقاڵێک لێم جیا نەبۆتەوە
کەچی هەرچی جارێ کە ئەتبینم،
ئەڵێی یەکەمجارە چاوم پێت ئەکەوێ
ئای، چەند تینووتم!

-٨-

بەهار ئەڵێی دزە،
بە شەرمەوە، لە پەنجەرەکانی ژوورەکەمەوە،
دێتە ژوورەوە
چونکە ئەزانێت: ژوورەکەم تۆی تیا نیت

-٩-

شەو تا بەیانی لە خەونما
چیرۆکی منالانەم بۆ ئەگێڕیتەوە

کە بەیانی، لە خەو هەڵئەستم،
بە تەنیا خەوتووم
ئاخ! خۆزگە سەرینێکی چۆڵ...
هەر هیچ نەبا سەرینێکی چۆڵ
لە پاڵ سەرینەکەمەوە بوایە

١٠ی نیسانی ١٩٨٧

**رەوەند** ..........

-١-

لە هەموو جێیەکا ئەتبینم،
نازانم تۆ گەورەیت، یا دنیا بچووکە!

-٢-

بەم شەوە باخەڵت پڕ کردووە لە باران
بە تەنیا بۆ دوورگەی برووسکە و ناو هەور
کۆچ ئەکەیت
ڕێگاکەت تاریکە،
ها چرای ئەم سەرە سووتاوەم هەڵگرە،
با ڕێگا دەربکەی
گەیشتیە هەر شوێنێ، تەمی ڕەش
لە دەوری تلوڤە ئەستێرە ئاڵابوو
بوەستە با چاوی ئەستێرە بتبینێ
پرسیان:
تۆ نوێژە بارانەی کام خاکیت؟
بڵێ: من نوێژێکی کۆچەری وڵاتی
لاوک و حەیرانم،

نامناسن؟
ئەو کەسەم، سەری خۆم کردۆتە رەشماڵ و
لە ژێریا
چی هەورە بروسکەو رووناکی دنیایە
ئاهەنگی سووتانی خۆیانی تیا ئەکەن.
شەوانیش تا دەمەوبەیانی
ئێشکچی گزنگم
بەو نیازەی کە چاوی هەڵهێنا،
پرشنگێ بفرێنم.
نامناسن؟
بیرتانە، ئەو شەوەی یەکترمان تیا ناسی،
یەکێکتان سووتا بوو،
بە چوارتان ئەتانبرد بینێژن
من تەرمی هەزاران ئەستێرەی عاشقم
بە سەرا کەوتووەو
بە تەنیا هەر خۆشمم.
دەسەر بنێ بە سنگمەوە،
با تێر بۆنی قژت بکەم
هەر بە تەنیا بۆنی گولاوی قژی تۆ
بۆ چرووکی سووتانم بیر ئەباتەوە
ئەوە قژت، لە ترسی هەناسەکانم گرێ داوە
یا رەشەبای سلێمانی؟

-٣-

بینیت تەمی رەش

دەوری تلوقە ئەستێرەی بەردا،
بەجێیان بێڵە
مەوەستە تا سەر دوورگەی گەڕۆکی
هەورە بروسکە
تا چاو بڕ ئەکات، باخاتی عەشقە
سەرانسەر سپی
گەڵای دارەکان، هەمووی باڵندەن
ئەم باڵندانە، لە پایزانا
کاتێ کە سەریان لێواولێو ئەبێ لە کڵپەی عەشق،
گڕ ئەگرن، ئەفڕن
ئەفڕن... هەر ئەفڕن

**ئاوێنە** ..........

-١-

لەبیرتان بێ، کاتێ چەند پارچە قورقوشمێ
لە باوەشی سەنگەرێکا، گیانم ئەسمێ
نەکەن هەرگیز لە یادەکانی کۆچما،
ئیکلیلی چەپکە نێرگزێک بدەن لە کێلی گۆڕەکەم
بزماری پۆستاڵی دوژمن شێلابێتی
گوڵی خاکێکم خۆش ناوێت جووتی دوژمن کێلابێتی
بلبلم بۆیە خۆش ئەوێ، کەلەپووری کۆیلایەتی،
بۆنەوەکەی جێ ناهێڵێ

-٢-

هەروەک ناوی خۆم لەبیرە، واش ئەزانم

ئەوەتەی هەم لە دوای مردنێک ئەگەڕێم،
ملم لە چەقۆیەک ئەسووم،
پێم بوێرن
مردن لای من بۆ کوردستان ئاواتێکە
شەویش پێوەی ئەتلێمەوە
مردن لای من بۆ کوردستان، سروودێکی ناتەواوە
ژانی هەڵبەستێکی سوورە
لە منداڵدانی مەلاشووی بەر سێدارەی «سەیفی قازی»دا
خنکاوە.
ئەمەوێ تەواوی بکەم، تەواو نابێ و لەسەرەوە ئەیلێمەوە
مردن لای من بۆ کوردستان، لێوی دەسگیرانەکەمە،
لە کەژاوەی زاوایەتی سەنگەرێکا ماچم ئەکا
مردن لای من بۆ کوردستان گوللەیەکە،
کە بە سەرما ویزە ئەکا،
گڕی لەدایک بوونەوەم تێ بەرئەدا

-٣-

چەند شەوێکە «حاجی قادر»
بە نهێنی، لە سنوور پەڕیوەتەوە
وتی: کە چوویت بۆ شاری «زێڕ»
بۆ ناو سەنگەری سەرجادەی «کاکە ئەرپە»
بە جامخانەی گوللە بێژی سەرتاشێکا
ئاگادارییەک هەڵواسە
لێی بنووسە: ئاگادار بن!
ئەیانەوێ بە زیندوویی چراوگی، چاوی باباگوڕگوڕ کوێرکەن.

ئەیانەوێ سەگەکانی قەسابخانەی گاورباغی
بە تەرمەکەی ئەرپە فێرکەن.
ئەیانەوێ دڵتەڕەکانی شۆڕیجە و ئیمام قاسم
جارێکی تر، لەسەر چۆپی و ڕەشبەڵەکی
قەرەدەرەو قەرەحەسن‌دا نەبینن.
ئەیانەوێ گەر ئەمجارە حاجی قادر بدۆزنەوە
نەک شاربەدەر، بیسووتێنن.
نازانن کە حاجی قادر ئەمجارەیان گەنج بۆتەوە
گەنجێکی ئێجگار بەگوڕە
ئێشکچییەکی چەکدارە، پاسەوانی
جۆگەڵەی خوێنی ژێر سکی کچێکی باباگوڕگوڕە

-٤-

لەسەر بانی خانووەکانتان سەنگەر لێدەن
لەزێرابی ژێر شەقامی بەردەرگای خانووەکانتانا
داوی نارنجۆک داچێنن
پەڕوی کچێنی ئاوەڕووی باباگوڕگوڕ ڕاست کەنەوە
ئاوزەنگی غار، لە قەبرغەی ئەسپی سەنگەرەکان بدەن
تا سەر لووتکەی چیای حەمرین مەوەستنەوە
دڵدارەکانیشتان فێر کەن
ئاڵتوونەکانیان بفرۆشن بیدەن بە چەک،
بیدەن بە تفەنگ و بە فیشەک،
بۆ بەرگری لە کوردستان
من جیازی دەسگیرانەکەم
تفەنگ و فیشەکدانێک و توێشەبەرەی نوێردووی نان بوو

کاتێ ڕۆیشتم
جله بووکێنی و ئاڵتوون و ئەڵقەی دیاری کردنەکەی بۆ فرۆشتم.
کاتێ برینداریش کرام، دەسگیرانی هاوڕێیەکم
له ئەشکەوتی بارەگای بنکەکەماندا، برین پێچ بوو،
برینەکەی بۆ پێچام
خۆزگە کاتێکیش ئەکوژرام
دوژمنەکەم تەرمەکەمی به مردوویی ڕائەکێشا و
به کوردستانا ئەیگێڕام!
ئەموت: ئوخەی شەقام و دێهات و شاری ژێر سێبەری
خۆری گیراوی کوردستان!
ئاواتەکەم هاتۆته دی و بووم به قوربانی هەمووتان.

سلێمانی ١٩٧٣/٤/٢٤

**سەمای قەرەجانه** ..........................................

-١-

هەر ئەیانویست بمگرێنن،
نه ئەگریام.
پیره مەگروونیان لەسەرما ورد و خاش کرد،
فرمێسکێ له چاوم نەهات
بەڵام دایه!
که تۆم خۆش ویست، فێر بووم بگریم.
مەڵێ: پیاو دڵڕەقه، ناگری،
بڕوا بکه، سیروان ئاوی چاوی منه
بۆیه که سیروانت جێهێشت،
ئەویش هەموو ڕۆژێ له دوات،

ئەوەندە بەسەر شان و ملی زمناکۆدا
سەرکەوتووە و بۆت گەڕاوە،
ئێستا گۆنا و گەردن و سنگی زمناکۆ
پاکی بۆتە نێرگزە جاڕ.

-٢-

دلنیام چاک،
من لە وەردیانەکەم کەمتر
لە بەندیخانەدا ئەژیم،
ئەو ئەگەر شەو ناشەوێکیش،
بچێتەوە ماڵەکەی خۆی،
لە باخەڵی ژن و منداڵەکانیشیا
خەون بە کلیل و کێلوونی بەندیخانەوە ئەبینێ؛
بەڵام من هەموو شەوێکم
تا بەیانی
لە خەونما وام لە باوەشی
جیهانێکی گەورە و سپی و بێ پەرژینا.

بەندیخانەی ئەبوغەریب ١٩٧٩/٧/١٢

**پەیام** ........................................

-١-

تاڵێک قژی خۆی دایە،
پێی وت: ئەمە پێناسەو ناو و نیشانی منە،
ئەبێ لەمەودوا نامە و هەواڵتم بۆ بنووسیت.
وتی: من خوێندەواری و نامە نووسین نازانم.
وتی: ئەبێ بنووسیت!

وتی: ئاخر نایزانم.
وتی: ئەبێ بنووسیت!
وتی: حەرفێک نازانم.
وتی: ئەبێ بنووسیت!

-٢-

هەر بۆ شەوێ لە خەونیا
فریشتەیەکی کراس کریشەی کورتە بالا
لە باخێکی ئاوێنەی رووناک و بەفرینەوە
بە لەنجەولار هاتە لای،
بە هێمنی دەستی برد بۆ سەرسنگ و سەر دڵی
لەسەرخۆ قویچەکانی کراسەکەی کردەوە
بە تیغێکی لە ئەڵماس تیژتر و ئەفسانەیی
سنگی دووتوێ کردەوە،
شتێکی لە مشتا بوو،
لەسەر دڵی جێی هێشت و
بە نیانی هەردوو توێی سنگی خستەوە سەریەک،
بەنێسکە و لەنجە و لاریش
گەڕایەوە ناو باخی ئاوێنە بێگەردەکەی
***

بەربەیان ژان و ژاری گینگڵێکی هەنگوینی
خەویان لە چاوی زڕاند
بێ ئەوەی خۆی هەست بکات
دەستی دایە قەڵەم و شیعرێک ئەمەی نووسیەوە:
من شمشاڵێکم بە لێوی تۆوە،

ئاوازم خەم بێ، یا خەندە و شادی
تۆ خۆت ئەمژەنیت،
شالووری دەنگم، ئەسپێکە بێ باڵ
دڵم کەژاوە...
باڵم بدەرێ با بفڕم بۆ لات.
وێنەی رووی مانگم، لە ناو رووبارا
ئەو هەر را ئەکا و من لەجێی خۆمم.
قاچم بدەرێ بە چاو نەبینرێ، وەک هی فریشتە
با بە دەربەند و هەردە و شارانا
بۆ دیدەنی تۆ، سەرم هەڵگرم،
بێ سەر و شوێن بم.
شەفەق و گزنگ، بکە بە گوڵجاڕ
با بۆنت بکەم.
کانیاوی گیانم بکە بە زەریا
با بە شەپۆلان فێر بم لە خۆما، سەرەڕۆ و یاخی
شڵپ و هۆڕم بێ و هەر لە خۆشما بم
خۆشی من هەر تۆیت، کە ناخمت کردە
گیتاری بەر با
شەو تا بەیانی، لەسەر سەرینی ناو رەشەباوە
ئازاری خۆش خۆش، ئەکەم بە ئاواز
دەستی کچۆلەی کلپەت داومەتێ،
بە هەردوکیشمان تەنیا کراسێک سەوز و ئاودامان،
بەڵام کوا کلپە، بێ سروە و شنە گڕی خۆش ئەبێ!
وەک ئەو درەختەی، ساتێ دیداری سروەی لێ ون بێ

لە سەما و لەنجە و جوولە ئەکەوێ
منیش بێ تۆ، وام
دەبا سروەت بێ و ئەم چنگە ئێسکە و
ئەو کچی کلپە ئێسک شیرینەت
سەر بکەم بە ناو هەتاوی قژیا و
سەما بکەین و نێلە نێل بگرێین
لەم سەمایەشدا هەرچیم بەسەر بێت،
ببم بە سووتوو، یا وەنەوشەیەک
تۆ خۆت ئەزانیت
*من شمشاڵێکم بە لێوی تۆوە*
*ئاوازم خەم بێ، یا خەندە و شادی*
*تۆ، خۆت ئەمژەنیت*

-٣-

کە لە شیعرەکەی بووەوە
هەستی کرد هەموو گیانی، تریفەیەکی زیوین
بۆتە خەرمانە پێوەی
چاویشی لێ بوو: مانگ و گوڵ، سروە و دلداران
ناو دەرگا و پەنجەرەکەی ژوورەکەیان گرتووە و
بە تاسەوە راماون
حەز ئەکەن پری پیاکەن، بیفرێنن بۆ خۆیان.

سەقز- ١٩٨٩/١٢/٢٠

**پریشکە خوێنی مە بە دڵی‌هەموانیانەوە وشک هەڵاتووە** ..........................

«پێشکەش بێت بە ڕۆحی ئەو کیژو ژنە جوانانەی
ڕۆژێ بە تفەنگی دەنگدارو تفەنگی بێدەنگ خوێنیان دەڕێژرێ».

هەریەکەیان بە تفەنگێک
بە پەتکێک بە چەقۆیەک کوشتوومی و
دەمکوژێ و
لاشەم لەگڵی دەنێ و دەشارێتەوە
پۆلێک پەپوولە خۆ بەدڵمدا دەکەن و
تفەنگ سوارکردن و چەقۆ سووینی
پیاوە دەست بەخوێنەکانم
وەبیردێتەوە
پۆلێک پەپوولە
لەسەر دڵی ماندووم هەڵدەنیشن
ڕەنگی کێژانەم دەڕەنگێنن و
گوڵانم پێ دەردەکەنەوە
پەپوولە زەردکەڵەیەک ناوی بەنازە
لەسەر لاچاوانم باڵی دەخاو
بێ نازی وگەردەن هەڵبڕان و
دەگڵ ڕۆکردنی خۆیم لەبۆ دەگێڕێتەوە

ئەها دیسان
دڵم لەو گۆڕەی کەوتووەو
هەریەکە نووکە کلاشینکۆفێکی تێ دەوەژێنێو
شەقێکی تێ هەڵدەدا

پەپوولە نارنجیەک ناوی شەوبۆیە
شەوەکانم پڕ لەبۆنی گوڵەکانی دەکاو
بەفیشەک دابێژان و گوێچکە هەڵبڕینی خۆیم
بۆ دەلاوێنێتەوە
پەپوولە سۆرەیەکی باڵ کەسک ناوی
دوعایە
باڵە کەسکەکانی لە ڕۆحی هەڵکڕووزاوم
دەخشێنێ و بەردەباران و
لەخوێنێ گەوزاندنی
وەکی
لەت لەتکردنی کوردوستانێ
ڕۆحم دەزورێنێتەوە
پەپوولە شێنکەڵەیەک ناوی ساباتە
کیژایەتیم شینتر لەدەریا وەڕەنگ دێنێ و
بە چەقۆ ئاژەنینی خۆیم
لەبۆ دەبێژێتەوە
پۆلێک بەپوولە
لەسەر گوڵەکانی گوڵزارێ
هەڵدەنیشن و
ڕاوەدوونان و حاشالێکردنی
ژنەکانم وەبیردێننەوە
لەدۆعا پتر بەردەبارانترو لە شەوبۆیە
فیشەک ڕێژانترو لە بەنازێ
گەردەن هەڵبڕاوترم

بکوژەکانم بە دونیایەدا دێن و دەچن و
دەخولێنەوە
لەساباتێ گەلەک چەقۆ ئاژەنترو
لە کەژاڵێ لووت و لێو هەڵبڕاوترو لەئامینێ
خنکێنراوترم و لە گوڵیزارێ ڕاونەراوترو
لە زارایێ سوتێنەراوترم و
بکوژەکانم ناویان لەخۆ ناوە پیاو
شەرەفیان کۆدەکەنەوە
هەورێک پەپوولە لەسەر لاچاوانم
ئاوادەبن و
چاو نەخشەی ئەڤ هەموو کیژانە
هەڵدەبڕدرێ و لێک هەڵدەوەشێتەوە
لێ ئەوان ئێستا
لە لەش کرینێ نەبوونەتەوە
هەریەکەیان بەناوێک هەریەکەیان بە دەمامکێک
هەریەکەیان لە ڕێگایەک لەتەمەنێک
لە شارێک لە خۆشەویستیەکدا
دەمکوژێ و کوشتوومی و
بەسەر لەشمدا تێدەپەڕێ و
لە لەشکرینی خۆی دەگەڕێ و
دەخەفتێتەوە
هەموو پریشکە خوێنێکی مەیان
بەلاچاوانەوەیە
هەر هەموویان

هەموو پریشکە چاوێکی مەیان بەدەستانەوە
وشک هەڵاتووە
هەر هەموویان
تێکڕا دڵۆپە خوێنی مەیان بە پێڵاوانەوە
ڕەق هەڵاتووە
هەر هەموویان
ناویشیان لەخۆ ناوە پیاو هەر هەموویان

**کوردستان** ..........................................................................................

دەستت بێنە
دەپەنجەکانت هەڵڕوانم
داخوا کوێ زێدمە
چ عەشقێک پیرۆزە
سینگت بێنە
سەری وێکەم
داخوا ئەوە ترپەترپی دڵتە
یا نێڵەی ئاگری نەوزۆرە
چاوان بێنە ڕۆچمە ناویان
پڕ لە ئاو و دونیا پانکەم
داخوا عەش لەمندا
چەندە جوانە و
گەردوون بە هەموو
هەسارانیەوە لە باوەشتە
کۆشت بێنە بێمە ناوی

شەپۆلان بدەم
دەریا و ئۆقیانووسان
تێکەڵی یەکدی کەینەوە
هەموو دڵۆپەکانت
لە مندا هەڵڕێژە
توند رامگوشە
دەستت بە بەژنمدا بگێڕە
وا بزانە کوردستانی گەورەت
بە بێ سنوور لە ئامێزە.

**شوورەیی دڵ** ..........................................

بە قوربانی ئەو دڵە بچکۆلانەت بم
هەموو رۆژێک کە سەر دەخەمە سەر دڵت
گویم لە ترپە ترپ و لێدانی دڵت دەبێت
هەست بەو دڵۆپە خوێنانە دەکەم
کە لەناو دڵتدا مەیون و
بە سەختی گۆڕان دەکەن
بەستێک دەڕووخێنم و لافاوی ئەشک بەرپا دەکەم
جاران کە بژوێلکەکانم تێکەڵ بە
بژوێلکەکانت دەکرد
شوورەی زیندانێکی ئەبەدی مەرگیان دروست دەکەن
تۆ لەدایکبووی دوای هەرەسی دین و مرۆڤەکانی
بۆیە کە دڵ دەخەمە نێو دڵت
زەوی و ئاسمان لەیەک ئاستدا بەدی دەکەم

ئێستاش کە ڕەشێنەی چاوەکانم
دەخەمە نێو مەندی چاوەکانت
دنیا ڕاستەقینەکان بەدی دەکەم.

۱۹۹۵/۹/۲۳

**کۆترە ژن**

ژن ئەو کۆترە جوانکیلانەن
هەموو دەمێ دەگمینن
تا لە ئاسمانی پیاودا بفڕن
ماندوو نابن
بە هێوری لەسەر گەڵاو دار و
گوێ سوانەی پیاو هەڵدەنیشن
ئێواران درەنگانێ پەنجەکانت دەهێنان و
کەمانچەکەی پشت ملمت لێدەدا
شێتییەکانمت هەموو سڕ دەکردن
لەسەر کەمەرم نۆتەکانت دابەش کردن
کەمانچەی هەمو دەمێ
سەرم لە بنانگی گوێی دەنای
پەنجەکانت لەسەر تیغارەی پشتم
هەڵدەنان و ڕۆدەنان
کۆترەکانمت لە خەو دەخستن

## شەوەکانی ئەو ژوورە

لەو ژوورەدا
نە هەناسەیەکی چاوەڕوانی
نە خۆزگەیەک بۆ تەمەن،
نە زەردەیەک
بە لێواری عومرێکی تووڕە و خەماوی،
نە ئێوارەیەکی خۆڵەمێشی و
نە هەناوێکی ساردەوە بوو
نە بزەیەکی ئۆخژناوی
بە رووخساری جێژوانی ئەوینەوە.

ئەو شەوە ساردانەی
غەم ئەبێ بە کاڵای ئەشک و
لەپی دەستە تەزیوەکان ئەخوێنێتەوە،
رابردوو
ئەنرێتە تابووتەوە و
کفن بۆ داهاتوو ئەدروێت
تەنها
سەمای گڕی مۆمێکی هەڵقرچاوە
تارمایی جەستەیەکی نامۆ
ئەنێتە سەر دیواری
ئەو ژوورە چۆڵەی
بۆنی مەرگ
زەمەنێکە

به لاجانگی تەنهاییدا هەلپڕژاوه

ئەو ژووره
خانمێکه
هەموو مێژووەکانی خوێندۆتەوه،
تەنها مێژوویەک
لەسەر رەفەکانی ئۆقرەیان نەگرت
ئەو ژووره
سیمفۆنیایەکه
پەنجه نەما
سێبەر بە سەر دێڕەکانیدا
نەکێشێت،
چرا نەما
دووکەڵ بە سیمای
زەردهەڵگەڕاویدا نەپژێنێت!
ئەو ژووره سارده
پڕه له یادوەری و
نامۆیی ناوەته ژێر
باڵه ماندووەکانی هەموو بەیانییەک،
که هاڵاوی
سەر پەنجەرەکانی حەزی
پێ دەسڕێت،
هەر که شەو دێت
ئەیکاته تابلۆیەکی بێ گیان و

لە زوور تارماییەکانەوە
هەڵیدەواسێت

هۆلەندا ٢٠٠٥/١١/٢٠

**ئەو دەریا شینە** ........................................

کەناری ئەمشەو
بە سۆزەوە
لەسەر شانی شەپۆلەکان پشوو ئەدات.
بڵاو ئەبێتەوە
هەر شەپۆلە و باوەش بە لما ئەکات،
پەردەکان بە پەنجە ئەگریت و
یاری لەگەڵ پێماندا ئەکات،
بە ئەسپایی بەرەو دەریا ئەگەڕێتەوە
لە سۆزی ئەو سۆز ئەپچڕێن.
ئێمە هاوڕێی دەریاین
ئێوارانی مانگەشەوە نەرمەکانی
کاتێ سێبەرمان روو لە ونبوون ئەکات،
روخسارمان دیار نامێنێ
دەریا لە ناخمدا جێگیر بووە
شەپۆلەکانی چیرۆکێکی تازەن
لەگەڵ ئەوەشدا پێویستە برۆین،
کۆچ بکەین و
لە سینەماندا یادەوەری ئەو ساتە هەڵگرین.
ئەو دەریا شینە
وەک ئەوینی ئێمە دڵی نەرمە

هەمیشە چاوەڕێمانە.
حەز لە بینینمان ئەکات
بە سەر شەپۆلەکانیدا بفڕین
بەرەو ئاسۆی بێ کۆتایی!

هۆلەندا ۲۰۰۵/٦/۲۵

## چیرۆکی کات

چیرۆکی کات
تەواو نابێت
رۆژگاری پڕ لە بەختەوەری
ناگەڕێتەوە،
کات ئەڕوات و
چرکە چرکە
جێگا هەر خۆیەتی
ناگۆڕێت و جوولە ناکات
سالانێکە نە چرپەیەک
لەسەر لێوەکان چرۆ ئەکەن
نە خەندەیەک.
بێدەنگییەک
لە ناخمدا شین بووە
کات ئەڕوات و لەگەڵ خۆیدا
پەڕەکانی عومر پێوە ئەدات
روخسار جوانی
لاویمان ئەبات
کاتێ دلمان لاو بوو

پڕ لە نەشەی خۆشی
ڕەنگی گوڵاڵە و
بۆنی بەهار
ئەپرژانە سەر خەندەکانی
بەرائەت و
پێکی کامەڕانیمان ئەنۆشی؟
ئێستا
گۆنا لە شەونم زیزە و
هەڵوەرین
بۆتە ئافاتی چرۆکان،
بایەکی بۆن سارد
باوەش ئەکات
بەو یادەوەرییانەی
هەرگیز نەگەینە تاوێک
کە لە ناویاندا خەیاڵ
مەستمان کات!

کات ئەڕوات
وەک شەمەندەفەرێکی
سەر لێشێواو
مولگە مولگە
جێمان دێڵێت
چەند هانای بۆ ئەبەین
لەگەڵ خۆی هەڵمان ناگرێت

چرکە مردووەکان
فڕێ ئەداتە
ئەوبەری شەقام و
ئێمەش لەمبەر جێ دەهێڵێت.
چیرۆکی کات تەواو نابێت
ڕۆژگاری پڕ لە بەختەوەری
ناگەڕێنەوە
کەنارەکان چۆڵ و ساردن
ئینجانەکان بێ گوڵ و
پەپوولەن
ئەوەی لە دوای ڕۆینی کات
جێ دەمێنێت
ئەلبۆمی پڕ لە وێنەن و
یادەوەرییەکان!
کەسێ نییە
مەملەکەتی سەرهەڵگرتووی
کات ڕێ پێ ببات
تاسەر لەنوێ
چرکەچرکە
بیانهۆنێتەوە و
بیانکاتەوە گەردەنمان
بە خەڵات!

سلێمانی، ساڵی ٢٠٠٠

## هەندرێن

لە هەولێر هاتۆتە دونیاوەو لە ١٩٨١دا بە هۆی ئاشکرا بوونی پێوەندی لە گەڵ کۆمەڵەی رەنجەدەرانی کوردستان، دایرەی ئەمنی بەعس راوەدووی دەنێن؛ ناچار هەڵدێ و روو لە شاخ دەکاو چەکی پێشمەرگایەتی دەکاتە شان. لە ١٩٩١ تووشی گەلێک ئازارو رەنج و زیندان دەبێ و بە هەر جۆرێ کە بێ دەتوانێ خۆی بگەینێتە هەندەران و لە وڵاتی سوید ببێتە پەنابەر.

ئێستا ماستەری لە مێژووی هزردا هەیەو سەرقاڵی خوێندنی تیۆری پەروەردەیە بۆ دەرس گوتنەوە لە زانکۆ.

تا ئێستا ئەم بەرهەمانەشی لە چاپ داوە:

- لە سێبەری کێوەکان ونت دەکەم، لە پێدەشتێک دەتبینمەوە-شیعر، ساڵی ١٩٨٦، لە بڵاوکراوەکانی پێشمەرگە.
- دوا نوێژەکانی چیا و سەفەری مەحاڵ – شیعر، ساڵی ١٩٩٣، سوێد.
- سکاندیناڤیا: دوورگەیەکی تر لە بخوور – شیعر، ساڵی ١٩٩٦ سوێد.
- نامەکانی مەرگ و نامەکانی روانینوانێک – ئامادەکردن و وەرگێڕانی کۆمەڵی نامەی شاعیری فەرەنسی: ئارتور رایمبۆ، ساڵی ١٩٩٧، سوید. چاپی دووەم ٢٠٠٧ هەولێر.
- سکاندیناڤیا دوررگەیەکی تر لە بخوور، کراوەتە سویدی و ساڵی ٢٠٠٤ چاپخانەی Tranan بڵاوی کردۆتەوە.

- مەهاباد لە ئۆلۆپیادەکانی خوادا، وەرگێڕانی کۆمەلە شیعرو چاوپێکەوتنی سەلیم بەرەکاتە، سالی ٢٠٠٤ لە سلێمانی، چاپخانەی سەردەم بلاوی کردۆتەوە.

- فەلسەفەی کۆچەری، وەرگێڕانی لە سویدی/دانمارکییەوە، سەنتەری ئەدەب و فیکری نما، هەولێر، سالی ٢٠٠٥ چاپی کردووە.

- ویڕای چەندان کتێب و کۆوتاری ئەدەبی و فیکری تر، کە بۆ چاپکردن ئامادە کراون.

## لە سوورگە بریندارەکانی تەنیاییدا

لە سوورگە بریندارەکانی تەنیاییدا خول دەخۆی و
گەردوون هێلنجە لە چاوان
ونبوونی خولگەکان، تەقینەوەی ماوەکان
زەناکان بەسەر پێستی دەنگە دوورەکانەوە دەنووشتێنەوە
لەشی سێبەرەکان دەجمێن و بیناییە ترازاوەکان دەتەنن
لەگەڵ سێبەردا بۆنی کەزیە وەنەوشەییەکانت،
لە رەنگی برژانگەکانی نامۆییمدا دەنیشێ و
پەرۆشی ئەم شەوەم دەخوێنێ
ساڵ رێدەکا
سێبەر تەمەن دەنووشێتەوە و
تۆش لەسەر پردی وشەکانەوە تێمدەڕوانی
وەک پیرێژنە کۆچکردووەکەی گەڕەک،
مەرگ ساڵی لە کۆڵ ناوە و
ئەستێرەیەک لە پەیژەی هەورەکانەوە دادەچۆڕێ
مەسیحیش لە میحرابی کاتدا بە دیار ماسی چاوەڕوانییەوە باوێشک دەدا
کات لە ئێستگەی شەودا میلەکانی هەراسانی دەوەرێ و
سەعاتیش لە خەودا دەمەیێ
ساڵ رێدەکا و ساڵێکی تر بەڕیوە دێ
فاڵ ئاسا بە هەموو رابردووی رێکردوو خدوو دەگرین
دیمەنەکان خۆیان لە رووخسارم دەسوون،
شپرزەیی نیگاکان پەردەی پەنجەرەکەم لادەدا،
ژنێک لەسەر تارمەکەدا، گەڵای فرمێسکەکانی کازاخ دەکا و
پێڵاوە کۆنەکانی ساڵیش لە کۆڵانەکەماندا کەوتووە

سبەی لەگەڵ دەستپێکردنی خوێندنگا،
منداڵان دەیبەن بۆ گۆڕەپانێ،
منیش چیتر نایبینمەوە
دەستەکان گوڵ و میهر، بە دەستەکانی تر دەبەخشن
لە لاڕوومەتەکان ماچ دەڕوێن
پێکەنین میوانی لێوەکان دەبێ
کاتیش شەمەندەفەری رازی ساڵ لێدەخوڕێ و
گەڵای فرمێسکی سەر ئەو تارمەیەش
تا پشت ئەم پەردەیە دەڕسکێ
گوڵەکان، لەسەر مێزەکان پیر دەبن
ماچەکان، تامی ئاسوودەییان دەوەرێ؛
پێکەنین لە گۆڕی لێوەکان خۆی دەنێژێ.
نیگاش پەردەکە جێدێڵێ و بەسەر سێبەرە بۆنگرەکەدا هەڵدەتڕوشکێ!
...
...
...
مۆم لە مۆمدانی روح دەسووتێ
نیگا لە باوەشی پەنجەرەدا تەون دەچنێ و
درەختی دووکەڵی جگەرەکان بە سیماتەوە دەئاڵێ.
کە گۆرانی یادە دوورەکانت دەبیستم،
لێرە گەرووی تەنیایی تەڕ دەبێ
ساڵەکان، کاتەکان رەنگی یەکتر دەگرن،
دەنگەکان لێکدەئاڵێن و
بۆشاییەکان دەلەرنەوە

لە مۆمدانی ژووردا رۆح دەسووتێ
با لە دەرێ یادی ناو سێبەرە مردووەکان گەسک دەدا و
چرای سەر کۆسپەکان قەدی تەمەکە رەنگدەکا،
شەو بەسەر کات و دیمەنەکاندا دەنیشێ
یادەکان لە خەونی «با»دا زیکری گومانیان گرتووەو
پێلاوەکانی سالیش لە کۆلانەکەمان کەوتووە
تەمی قەلەمیش لەسەر دەفتەری تەنیاییدا
تا دێ چلوورە دەبەستێ!
لە کۆشیعری «دوا نوێژەکانی چیا و سەفەری مەحاڵ»ەوە
شەپۆلێکی لە مێگەل راپسکاو
پێناسەی گەردوونی دەروونێکی هەدادانە
زایەلەی تەنیاییت.
پرسیارێکی بێهوودەیە:
ناسینی ئەو منە!

**تەنیایی** ..........

ئاسمانێک لەناو چاومدا شۆڕ دەبێتەوە
بارانێک لە زمانمدا گۆدەکا و
هێشتا گەوالەی رۆشنایيت داناکا
وەک هەور بەناومدا هەلدەزنێ
رامانی ئەو زەوییە.

**سەهەندەیی** ..........

مەرگ رۆلی بەهاکان دەلیزێ

لە ڕێک کەوتنێک لەگەڵ مەکری دووڕوویییەک لە ئاوێنەدا بترازێ،
هیچی تری نییە داستانی ئەم ڕۆژگارە
جادووگەرییەک لە تۆدا
منێک لە جادووگەرییەکدا
منێک لە تۆدا:
کامەمان ڕاستینەین؟

***

خوێنێکی کوڵاو،
شێتییەکی پیرۆز،
وێکچواندنێکی هەرزان لە نێوان دوو سەهەندەدا،
لەهەڕاج کردنی بەهاکاندایە
خەمساردی ئەم بوونە.

**پەژارەیی**

ڕۆژانە قەقنەسێک دێتە ناو دڵمەوە
لە بوولێڵێکدا دۆستە کۆنەکان، ماڵی چیایەکان،
بێدەنگ یادەوەریم دەلەرێننەوە
درەنگە و منێکی میوانیش دەمێکە لێرەمە
ڕۆژەکان، ژمارەی سەعاتەکان، وەک زرینگانەوەیەک لە کانییەکان،
پێکڤە ئاوازێکن
لە ژەنینی پەژارەیی من

ئەم ئاگرە دەمێکە دایساوە،
نە دەکوژێتەوە، نە کەسێکیش ڕێی دەکەوێتە ئێرۆکانێ
لە پەنایدا خۆی گەرم بکاتەوە
هونەرمەندا!
وەک شەو وای،
لە تاریکیتدا بزر دەبم
هەر ئێژی تەمی، بۆم ناگیرێی و
دەستم بەر دەستت ناکەوێ
گەرەکمە نیگارت بکێشم،
وەک ئاو وای نازانم ڕەنگت چۆنە
چوارچێوە و
پالێتی ڕەنگەکانم توور دەدەم
خۆمم لێ دەبێتە نیگارکێشێکی دەستەپاچە
ئاگر و ئاو
ئەم ئاگرە دەمێکە دایساوە،
نە دەکوژێتەوە، نە کەسێکیش ڕێی دەکەوێتە ئێرۆکانێ
لە پەنایدا خۆی گەرم بکاتەوە
ئەم جامە دەمێکە پڕبووەو لێی دەڕژێ
نە کەس قومێکی لێدەخواتەوە،
نە خێرەومەندێ ئاوی شێرەکە دەبەستێ
ئەم دڵەی من لە مێژە عەودالێ تۆیە، نە پێت دەڵێ
تا بزانی کە تۆی، نەیش ئەڤینت لە خۆیدا دەکوژێ و بەجێت دیلێ

### ئارەزوویەکی تەماحکارانە

سەد ساڵ دوای ئەمساتە
تۆ لە تەک چوار منداڵ لە سەر چیمەنی ژێر دارتوویەک،
گوڵە نێرگز دەچنیتەوە
سەدساڵ دوای ئەمساتە،
سەد کۆتر لە سەر سەد گومەزی گمە دەکەن
سەد منداڵ لەباتی سەد بەردی نێو سەد بەردەقانی،
سەد پەپوولە بەرەو ئاسمان بەڕێ دەکەن
سەد ساڵ دوای ئەمساتە،
سەدێ لە سەدهەزار خەونەکانی منیش دێنە دی

### لەباتی چەپکێ نێرگز

میوان
بەیانییان کە خۆر هەڵدێ، بە گمەی کۆترێک وەخەبەر دێم
ئێواران پەرییەک دەمخاتە سەر باڵەکانی، دەمباتە سەر ڕۆخی ڕووبارێ،
پرچم دەشوا
شەو تۆ دێیت و لێم دەبیتە پەپوولەیەکی خەواڵو،
دەخوازی ببمە گەڵایەکی شێدار و بتخەوێنم لە باوەشما
ناوێرم باوەشمت بۆ بکەمەوە،
دەترسم، ئیدی سبەینێ، کۆترێک هەڵمنەسێنێ
پەرییەک نەمبا بۆ گەشتی سەر ڕۆخی ڕووبارەکان
کەچی نە دەتوانم دەستبەرداری تۆ بم و
نە هی ئەوان

بۆیە گشت سبەینانێ پێش خۆرهەلات، پەپوولەیەک لە پەنجەرەکەمەوە
به ئەسپایی
هەلدەفڕێ بەرەو شینایی ئاسمان.

**ئیلهامبەخشێ**

چ خۆشە چاوەڕوانی تۆ
چ خۆشە هەم بوونت، هەم نەبوونت
تۆ هەردەم گۆرانییە نەگوتراوەکەی منی
تۆ هەردەم تابلۆ نەکێشراوەکەی منی
تۆ هەردەم ڕازە ئاشکراکەی منی
تۆ نەبی،
خەون نابینم.
تۆ ببی
خەون بە کێوە ببینم؟

**ئاوێنە**

جار جار دێیت و وەک کۆترەکێویلەیەک بە سەر داری ڕۆحمدا هەلدەنیشیی
بێ مۆلەتخواستن دەکەویتە گمە،
لە جامی تەڕی چاوەکانما بەژنی شینکەلانەی خۆت دەبینی
لە باتی بسلەمیتەوە
داری خەونەکانت چەکەرە دەکەن

**پرسیار**

گوێم لە ترپەی دلتە

سرتەکانت دەناسمەوە
گەرەکتە ببیتە میوانم
مەخابن!
داری بەر پەنجەرەکەم هێشتا بێگەڵایە
ناکرێ من ببمە میوانی تۆ؟

## ڕێگای هات و نەهات

بیرتە وتم ئەم دارستانە زۆر چڕە
سەری لێ دەرناکەین
ئەم ڕێگایە زۆر درێژە ، هەموویمان پێ تەی ناکرێ.
دڵم وتی
لە سەر پانتاییەکی سەوز سەردەردەکەین
وتم
لە نێو گلێنەی چاومانا ئەوە ڕەنگی گەڵای
هەمان دارستانە!
دڵم وتی
بە گمەی جووتێ کۆتر بەخەبەر دێین
وتم
نا ئەوە دەنگی نمەی بارانە

## پلەکانە

من دەڵیم با دەوارێ هەڵدەین
ئێرە بکەینە نیشتمان.
دڵم دەڵێ

با لێرەوە پلەکانەیە سازبکەین
بەرەو قوولایی ئاسمان
شنەی با، رامانژێنێ
وەرە با لای ئەستێرەکان
چێبکەین سەرزەوینێ
پەلکەزێرینە لێکەینەوە
بیکەینە پۆپەشمینێ
بۆبالشتی ژێر سەرمان
سازکەین، لەمانگ
سەرینێ
لایەلایە
لاولاوێک دەکەمە پەیژە
بە رێوەم بەرەو سەربانێکی لە رەیحانە چێکراو
ئاو عەتری خۆی بە سەردا دەپرژێنێ
چاوم تینووی دیتنی ئاسمانێکی ئەفسانەییە
لەوێ پەپوولە مامۆستایە
کۆتر دادوەرە
منداڵ هاولاتییە

***

بەرێوەم، زۆر لەمێژە
جوتێ کەوشم لە پێدایە لە پەرەی گوڵ
قەیتانەکانی لاسکی دوو تۆلەکەی سەوزن
کراسێکم لە بەردایە لە خەرمانەی مانگ
دلساردم مەکە

لە شلغەوە تا شز

تۆ لەوێ بە
سەرم لە سەرڕانت دانێ و
گۆرانییەکم بۆ بێژە
کۆلانێکی نازهەڵگر
بەرەبەیانێ بمبە پیاسەی کۆلانێکی تازە ئاوپرژێنکراو
لەوێندەرێ
تۆپ و بووکەڵەی منداڵانی دوێنێ
لە بن سێبەری دارچنارەکانیدا مابێتنەوە
هێشتا بەنازەوە خەویان لێکەوتبێ...

**که مەرگ دێت ژیان لەوێ نییە**

ژیان کۆلانێکە پڕە لەهاتووهاواری
ژنانی بنێشت لەدەم،
قوقەی کەڵەشێر،
بانگی دەستگێڕو
تکە تکی ژێر مەرکانە.
ژیان کۆلانێکە،
فەنتازیا، بە پێی پەتی خەریکی ماڵەبەجێنەیە لەگەڵ منداڵاندا
ژیان دەستخستنە سەرچاوە لەبەردەم تینی خۆرا،
بۆ بینینی لەنجەی جلی سەر تەناف
لەسەر رووی پەنجەرەی ماڵە دراوسێ.
ژیان، تەقولبایە لەدڵی بەختەوەری
قاقای پێکەنینە بەدەنگی بەرز.

ئاه! مەرگیش،
تەنها شەقاوەی کۆڵانە
تەنها مەرگ شەڕ بە هەمووان دەفرۆشێت،
لافیتەی رەش لەسەر سیلەی کۆلان هەڵدەواسێ،
بنێشتی دەمی ژنەکان دەخاتەوە ناو گرێی فەقیانەکان،
کەڵەشێر سەردەبڕێ،
شەرم دەخاتە ناو بانگی دەستگێڕ
مەرکانە پڕ دەکات لەدەستی چلکن بۆ خواردنەوەی ئاو لەدوای فاتیحا،
فەنتازیا لە منداڵ دەستێنێتەوەو بێدەنگی دەکات،
مەرگ جلەکانی سەر تەناف بەتەڕی دادەگرێت،

دەستدەخاتە سەرچاو بۆ نەبینینی فرمێسک لەپەنجەرەی دراوسێوە.
مەرگ خێرا، بەپرتاو، ناوادە،
وەک فڕینی پۆلێک چۆلەکە لەسنگی دارتوویەکی کۆلانداو
نیشتنەوەی واشەیەک. ئاوا دێت.

ژیان پرسیارێکە بەبەردەوامی ڕەنگەکانی دەگۆڕێت
بەڵام مەرگ تەنها یەک ڕەنگ
یەک هەناسەی سارد و تەواو.
ئاهـ هـ هـ!
ژیان چەند پرسیارێکی بەردەوامە
مەرگ چ بێدەنگییەکی ئەبەدی.

نەورۆزی ٢٠٠٧

**ژیان لە کۆلانەکەی ئێمەیە**
**مەرگیش لەچەند کۆلانێک لەولاتر**

ئەی مانگ!
من کوڕی تۆم،
من کوڕی بەتەنها جێماوی تۆم
لەسەر زەوی.

کە بیر لە تۆ ئەکەمەوە
خاڵخاڵۆکەکان لە برینەکانمەوە ئەفڕن،
لەگەڵ باڵکردنەوەی پەڕەسێلکەکانی ژێر سنگمدا
پاڵتاوە ڕەشەکەم و ملپێچە سوورەکەم با ئەیانبات،
ڕوتوقووت وەک سەر ڕووی پەنجەرەیەک

هەڵم لەجەستەم هەڵئەستێ و ئەڵێم:
ئەی مانگ،
من کوڕی تۆم،
من کوڕی بەتەنها جێماوی تۆم
لەسەر زەوی.

بین بە جامۆلکەیەک ئاوەوە ئەنێم و
سنگم پڕ ئەبێت لە شینایی ئاسمان،
وەک ئاوێنەیەکی لەدەستکەوتووی کچێکی عاشق
کە خەیاڵی ماچێک لەگەڵ خۆی ئەبیات و نایهێنێتەوە
من ئاوا شل شل ئەکەومە سەر هەرێزێکی تەڕ.
لێدانی بە پەلەی دڵی پۆلێک چۆلەکە دێتە ناو سنگمەوە،
دەمم پڕئەبێت لە جیکە جیک،
ئیدی تێدەگەم ماڵی خودا لەناو وشەدایەو
ماڵی تەنهایی من لەسەر زەوی.

تۆ لەناو خۆمدا دائەنیشێنم
بۆ ئەوەی بەلاتا تێپەڕیم بانگم کەیت،
نەبادا تەنهایی
بمکات بە بەچکە پشیلەی بەر پەنجەرەیەک،
تا ئەبەد بەڕووی وجوودا بمیاوێنم و کەس گوێی لێ نەبێت.
تۆ لەناو خۆمدا دائەنیشێنم
تا بەتاریکی نەچمە سەر گۆمێک
کەمەرگ تیایدا نووستووە.

تا بەتەنیا ئێواران لەدەریادا مەلەنەکەم
کاتێک کە مانگ بەئاسمانەوە سەیری تەنهایی من ئەکات
و
من هەر بانگی ئەکەم و ئەو گوێی لێ نییە.
ئەی مانگ!
مەنفا ڕاکردنە بەپێی خۆت بۆسەر خاچ
بۆ ئەوەی لەسەر هیچ زەوییەک نەمرێت
کە نیشتمان جارێکی تر هی تۆ نییە.
من لە نێوان نیشتمان و مەنفادا
مالی وشە هەڵئەبژێرم بۆ مردن،
بۆ ئەوەی هەمیشە قەبرێکم هەبێت لە کتێبێکدا لێی نووسرابێت:
ئەی مانگ
من کوڕی تۆم
من کوڕی بەتەنها جێماوی تۆم
لەسەر زەوی.

**سووتان**

لە بەفرییەتی خۆرا
گومانێک نییە
هەروەک زەریا
لەبادا پیاسە دەکات
یا گەزیزە
بێزار لە هەنگاوی هاوین
گوڵەکان دەگرین
ئەو دەمەی
مەڵەغانێ دەلەوەڕێ
هەستەکان دەدڕێن
ئەو کاتەی
تۆپەکان دەقریشکێنن
وەچاو جۆبار
ئەو چرکەی،
دەنگی هیوا دەسووتێنن

**ئاوێنە**

قەنارییەک
خۆی بە میلەی قەفەس‌دا دا
...
ئاوێنەکان،
شێتی دیمانەی
گوێریژن

**خاک**

گەر لە شاری غوربەت مردم
لە بۆنی خاکی زێدەکەم
مشتێکم لەگەڵ بنێژن
با جارجارە
تاسەی دووریم
بشواتەوە

**پردی تاسەیەک دەفڕم**

دا
دەڕژێت
بەسەر دڵما.
مەنگەشەوێک
شنەی نەرمی،
غەریبانەی ڕێبوارانێک
هەر دێت و سەوزتر دەچێ
لە حەوشەیەک بزەدا
قەتیسە خولیام
لە باخچەیەک تیشکا،
هێلانەیە چاوم
گۆنەی سەوزی پەپوولەیەک،
دەهۆنمەوە
ئەگەر،

مەعریفەتی باڵەکانی هەڵمچنێ
پردی تاسەیەک دەفڕم
ئەگەر،
باڵەکانم شین بینەوە.

**سەفەر**

---

لەگەڵ هۆزێکی نامۆدا
دەڕۆم
چاوەکانم
دڵداری پۆلێ گەوهەرن
ئای کە چاوم
دڵ
ڕەویەکە لە ژان و
سەرلەچڕژان
توامەوە
بەر لە بوونم
بە تاوی کۆچ و
نێزەی با
بەرەو هەرێمێکی
دەڕۆم
بەرەو شوێنێ
مرۆکانی
شێعر بە شمشاڵ بنووسن
ژیان لە چاو

حەیران بە با
نە ڕەنگی خەم بناسن و
نە «نیل»ی کۆچ

**هەی لە کۆچی چەپکێ پەمە**..........................................................
واوە مەیگێڕ
ڕاوڕاوێنی
هەسێرەترین تاسەمە
چەپکێ هیوا
دەبزوێت و
شینی سووری
جووتێ کۆتر
هەڵدەوەرن
ئەسرین
خولیا
چەم سوور دەفڕێ
ئاسمان هەورێکی غەوارە
دادەڕێژێ
خەمم لە ئامێز دەگرم و
چۆکم هەنسک
چیای گوڵ ڕەش
بزەی وەریو
شێعری زەرد
شاری نامۆ

هەڵمدەچنیٚ
سۆزی شمشاڵێکی ونبوو
بە بارتەقای
حەڵەبجەدا
شۆڕ دەبمەوە
نەورۆزی ڕەش
چیای گوڵ . . .
توانەوە دەهۆنمەوە
کۆچستانی ئەندێشەمە
شاری مەلوول
گوندی ژاکاو
ڕووباری ڕۆ
باخستانی بەهێیمە
ئایەتی بێڕەنگی گۆنەم
لە ناخمدا . . .

**نامۆ**

نامۆم
نامۆ
نامۆتر لەو چیرۆکانەی
هەتاو
بۆ شاری خوێندەوە
لەو بزانەی
بەم ڕۆژگارە

ڕەنگاڵەیەکی غەوارەن
ئاواتم
پۆلە هەورێکە
هەر نەبێ
دڵۆپە ئاوێک بنووسێ

**ڕاڤە** ........................................

من لە کەژاوەی
شۆخێکا
شاخم ناسی
لە بەلەمی ئەوینێکا
بوومە شێعر
لە چارداخی هەنسکێکا
خەمم نووسی و
لە ئامێزی دوورییەکدا
تامی مەرگ
ژیان
لە خونچەوە دەپشکوێ و
لە خەزاندا
دەکوژێتەوە

**خەمی نان** ........................................

شەو بوو
خەڵک

لە ژێر شۆقی چرای نیئۆن
یا لانی کەم
لێفەشرێکا
نوستبوون
تووتکێکیش
لە ژێر حەریری کرێوە و
لە سەر دۆشەکی سەهۆڵین
بیری لە نان
دەکردەوە
لە ڕەنگی مان

**ڕەنگ** ..........

هەموو جیهانم پشکنی
زۆر خۆرم دی
تامی سێبەر
بەبر
مەزەی بێچووە پشیلە
شێر
بۆنی مشک
دەمامک
ڕەنگی مرۆڤ و
شێعری بێڕەنگ

**راسان** ..........

تا کەی بۆ ماچێکی سێوی خۆرین

بتلێمەوە و

گوڵاڵە سوورە بڕسکێم

من

کۆترێک دەبێژم

سپیتر

شنەیەک دەمکێشێتەوە

ڕۆژینتر

خرۆشاوم

تا سەوزتر

دابباریێم

«کە وایە هەم»

لە سلێمانی لە دایک بووەو هەر لەوێ خوێندوویەتی. لە زانکۆی هەولێر بەشی جیۆلۆجی خوێندکار بووە. لە ١٩٨٣دا لە خۆپیشاندانی زانکۆدا برینداردەبێ و ناچار هەڵدێ و واز لە خوێندن دێنێ. هەر لەو ساڵەدا تەواوی کاتی خۆی بۆ کاری ئەدەبی تەرخان دەکاو «قەسیدەی نیشتمان» دەنووسێت.

لە ١٩٨٨دا رۆمانی ئێوارەی پەپوولە دەنووسێت. لە ١٩٩٤دا لە سۆنگەی شەڕی براکوژییەوە کوردستان بەجێ دێلێ و دەگاتە ئەڵمانیا. لەوێ دەگەڵ تاقمێک لە هاورێیانی گۆڤاری «رەهەند» دەردەکەن.

بەرهەمەکانی ئەمانەن:

-کۆی بەرهەمە شیعرییەکان ١٩٨٣-١٩٩٨.

- دواهەمین هەناری دونیا -رۆمان.

- بوهیمی و ئەستێرەکان-شیعر.

- ئیشکردن لە دارستانەکانی فیردەوسدا-شیعر.

- ولام لە رۆژگاری ونبوونی پرسیاردا- سێزدە چاوپێکەوتن لە گەڵ بەختیار عەلی.

- ئیمان و جەنگاوەری- فیکری سەلەفی و دەرکەوتە نوێکانی لە رۆشنبیری کوردیدا.
- خوێنەری کوشندە- کۆمەڵە وتار.
- شاری مۆسیقارە سپییەکان- رۆمان.
- تا ماتەمی گوڵ... تا خوێنی فریشتە- کۆی بەرهەمە شیعریەکان.

بێجگە لە مانەش دەیان وتار و لێکۆڵینەوەی جۆراوجۆری لە کۆڤارو رۆژنامەکاندا بڵاو کراوەتەوە.

**پیاوکوژەکان بۆ تەنهان؟**

چونکە کوشتن سێوێکە لەگەڵ کەسدا بەش ناکرێت
چونکە پیاوکوژان بەبێ تەنهایی، بێزاری ئەستێرەیان لێ دیار نییە
هەموو هاورێیەک خوێنی نێچیرەکان حەرامتر دەکات
هەموو دۆستێک نەورەسێک زیاتر دەتۆرێنێت
هەموو دەستگیرانێک پشکۆیەک زیاتر دەکوژێنێتەوە
پیاوکوژەکان تەنهان
چونکە تەنیا پیاوانی تەنها دەرەقەتی گوڵەباغ دێن
بە شیری ناو ئەم پیاڵەی خودایە دەوێرن
بە بۆنی ئەم فرۆیەی خەیاڵ نامرن
تەنیا پیاوانی تەنها خۆرهەڵاتی گوڵاڵە دەبینن
تەنیا مەلەوانی تەنها چاویان لە باکووری ئاوە
تەنیا خوێنەوانی تەنها باشووری رۆحیان لێ دیارە
هەر ئەوان
گوڵاوی شەوی ئاشت بوونەوەی کوکوختێ و مانگ بۆن دەکەن عەتری خاڵی
بوونەوەی خەنجەر لە گومان
عەتری پڕبوونی چەقۆ لە ئەفسووس
بۆنی زیادبوونی دڵنیایی نیچیرەکان
دەڵێن:
کوشتن، بەربوونەوەی شووشەیەکە لە دەستی ساقییەک
بەربوونەوەی بەهارە لە دەستی درەختەکان

**پاڕانەوەی دووهەم**

ئەی خودایە!

بە کۆتر بڵێ بمبوورێت
با گەردنم ئازاکات ئەو
عەفووم کەن هەور و ئەستێرە
عەفووم کەن خۆر و مانگەشەو
ئەی خودایە!
با دەرچم لە جوانی و لە دەریا
با دەرچم لە پەپوولە و خەیاڵ
با دەرچم لە غەمی حەقیقەت
با بگەم بە شکۆفەی مەحاڵ
ئەی خودایە!
بمبورن ئەوەی لێیان بووم
بمبورن ئەوەی لە من بوون
بمبورن ئەوەی لێیان چووم
بمبورن ئەوەی لە من چوون

**جەلاد**

جەلادەکان بەشێکن لە من و تۆ
بەشێکن لە موعجیزەکانی خودا، دەچنە بەهەشت
ئەوان پەشیمانی شەوێکن لە دەرگا رۆشنەکانی خۆی
پەشیمانی گوڵێکن لە رەونەقی بەیانیانی خۆی
دەچنە بەهەشت
کەسیش نییە پێیان بڵێت
بەهار بەهاری تۆ نییە
باران بارانی تۆ نییە

گەمەی تۆ لە دەرەوەی ماڵی ئینسانە
شەوی خۆت تێکەڵ بە ئێوارەکانی ئێمە مەکە
بەیانی خۆت مەبەستە بە باڵی پەپوولەکانی ئێمەوە
دەچنە بەهەشت
ئەگەرچی مەرگی من ترازانی دەستی ئەوە لە شمشێرەکان
بەڵام ئێمە لێرەدا لە چاوەڕوانی قافلەکاندا دەوەستین و
ئەو دەچێتە بەهەشت

**ئەی ئەوەی من گوناهبار دەکەیت!** ............................................

ئەی گەمژە گوناهی من نییە تۆ ناتوانیت یاقووت راو بکەیت
گوناهی من نییە تۆ لە جنسی خشۆکەکانیت و من بە رەگەزی تۆڤان
من لە جنسی خوداکانم و تۆ لە جنسی مێرووولە خووساوەکانی ژێر باران
من سەر بە خێڵی ئەستێرەناسەکانم، تۆ کرمفرۆشێکی بیمار
تۆ پاسەوانی کەلاوەیت، من ئەندازیاری یۆتۆپیام
تۆ لقی درەختێکی کرمێیت، من نوور و گڕ و رەشەبام
گوناهی من نییە تۆ ناتوانیت گوڵ بگریت
گوناهی من نییە، سەری تۆ لە دڕک زیاتر هیچ ناگرێت
ئەوەی من دەینێرم بۆ ئەبەدییەت بە تۆ ناگەڕێتەوە
ئەو خاک و زەریایانەی من دروستیان دەکەم، بە گەزی پەڕپوتی تۆ ناپێورێن
تۆ ئەی کڕیاری کۆنی زبڵخانەی ژیان!
دانی تۆ لەوە پیرترە، گوێزی پڕ حیکمەتی من بشکێنێت
لووتی تۆ لەوە زەلیلترە، بۆنی باغی من بکات

**بەشکردن** ............................................

که جیهانمان بەشکرد
سبەینێی پۆلا بۆ تۆ
دلی ناسکی بەیانیانیش بۆ من
گیای قەتارچییە خەیالییەکانی ئەمشەو بۆ تۆ
حەشیشی شێداری ئێواران بۆ من
عەتری سەماکان بۆ تۆ
خوێنی درەختەکان بۆ تۆ
کەرویشکی سەراسیمەی ناو دەغلەکان بۆ تۆ
چۆلەکەی بچوکی ژێر تەپکەکان بۆ من
نا هاوڕێم، نا
نیشتمان بۆ تۆ، شەرەف بۆ تۆ، شەراب بۆ تۆ، یار بۆ تۆ
بۆ منیش خۆم.
گیا بۆ تۆ، دەغل بۆ تۆ، ترێ بۆ تۆ، چرا بۆ تۆ
بۆ منیش، خۆم.
تفەنگ بۆ تۆ، جەنگ بۆ تۆ، خۆر بۆ تۆ، خودا بۆ تۆ
بۆ منیش، خۆم.

## مەهاباد قەرەداغی

راوێژکاری سەرۆک وەزیران کوردستان لە کارو باری ژنان و نووسەرو شاعیرو رەخنەگری کۆمەڵایەتییە. یەکێک لەو چالاکانەی مافی ژنانە کە لە تەمەنیدا لە هیچ تەقالایەک بۆ داکۆکی لە مافی ژنان کوڵی نەداوە.

لە پانزدە سالاندا خەباتی سیاسی خۆی دەست پێکردووەو هەر لەو تەمەنەشدا بۆ ماوەی یەک ساڵ لە زیندانی بەعسدا بووە. بە هۆی ئەو بەرژەوەندیەی کە بوویەو ئەو رێبازەی کە گرتوویە بەر، ناچار وڵاتیان پێ تەنگ کردوەو بەرەو هەندەران ئاوارەیان کردوە.

بێگومان مەهاباد کاریگەریەکی ئەوتۆی بە سەر بزاڤی ژنانی کورددا هەم دژبە بەعس و هەم سیستەمی پیاوسالاردا هەبووە.

هەندێ لە بەرهەمەکانی ئەمانەن:

- نەخشەی دوارۆژی کرێکار، شیعر، کوردستان، ١٩٩٢.
- پانۆراما، شیعر، سوێد، ١٩٩٣.
- شاخ کێلگەی گەنمە شامییە، شیعر، سوێد، ١٩٩٤.
- میدالیا، شیعر، سوێد، ١٩٩٥.
- Sno Fagler (بە زمانی سوێدی)، شیعر، سوێد، ١٩٩٧.
- هاژەی رۆح، شیعر، کوردستان، ١٩٩٩.
- کۆچ، چیرۆک، سوێد، ١٩٩٤.

-لە پێناوی ژیانەوەی ئافرەتدا، لێکۆڵینەوە،سوێد، ١٩٩٥.
-دانپیانانێکی پیاوانە، وەرگێڕان (چیرۆک)، نووسینی: د.نەوال سەعداوی، سوێد ١٩٩٤.
-نانی ژەهراوی، شانۆگەری بوبەری، نووسینی ڤیسیلین هانچێف، سوێد ١٩٩٤.
-شیعر هەناسەی گەردوونە، هەڵبژاردەیەک لە شیعری هاوچەرخی جیهان، سوێد، ١٩٩٤.
-فەنتازیا، کورتە چیرۆک.
-ژن لە پەراوێزی مێژوودا، لێکۆڵینەوە.

وەکوو هەناسەم و زریان
وەک خورەی چاوم و تاڤگە
شەوان
سێبەری دڵێکی سۆزناک
دەکەم بە سەرینی دڵم
سێبەری چاوێکی خۆر رەنگی دەکەم بە چاویلکە و
رابردووی پێ دەخوێنمەوە
هەبوو... نەبوو
کەس لە تۆ عاشق‌تر و
کەس لە من شێت‌تر نەبوو

شام- ١٩٩٢/١٠/٨

**خۆشم دەوێی کە واتە من هەم**

ئەم جەستە رووبارەم لەم چەقە رێیەدا نوێژ دەکات
ماسی لە ئاو دەپارێتەوە
ماسی خزمی رۆحمە
ئەم بۆشاییانە پڕن لە بوونت
تامەزرۆی بینینی شتە پڕ مانا و نەبینراوەکان دەکەم
رۆح
وزە
تۆ
لە ناو رووناکیدا بۆ نهێنی نیوەشەو دەگەڕێم
لە ناو بازنەکاندا بۆ پەیام
لە ناو خۆمدا بۆ
تۆ

رۆح
وزە
تاڵە پرچێک پردێک دەنووسێتەوە
پۆلێک دەریا لە ئاسۆدا وێنەی کۆتر هەڵدەفڕن
کازیوە کۆرپەی کام تیشکی لە خۆر تۆراوە؟
بە چاوی قەڵەم سەیری هۆش دەکەم
لە سەرتا بە دوای شتە بێڕەنگ و نەبینراوەکان دەگەڕێم
خۆم
وزە
رۆح

١٩٩٤/٤/١٠

**ژیانەوە**

لە چاوەکانت داستانێ دەخوێنمەوە
سوورە وەک رەنگی گوڵاڵەو
گەورەیە وەک فراوانی ئاسۆی هیوا
لە قەڵاچەی گلێنەتا ژانێ سپی دەهۆنمەوە
چەسپاوە وەک واژۆی بڕوا
کە دەروازەی ئاسۆرەکانت واڵا کرد
روانیم ژانە ئاڵەکانت ئاوێنەن و
خۆمیان تیا دەدۆزمەوە
دوێنێ پێم دەگوتی هاوڕێ
ئەمڕۆ لە زیندانی ژانە سەختەکانی خۆم و تۆوە تێت دەڕوانم
دەڵێم هاوبیرو هاوژانم
دەمێ بوو خامەی ژان گرتووم وشەی قەتیسماوی دەجوو

دەمێک بوو هەوری سەرشێتی هونراوەم
وەک پەیکەرێکی مانگرتوو
چاوی بڕیبووە بەستەڵەکی سەختی زستانی ئەوینی ماندووم
ئێستا لە جیهانی دڵما ڤیستیڤاڵی هۆنراوەی ئاگرین و
شیعری ئەوین
سەرچۆپییان دابەستووە
من چیم جگە لە شاعیریێ؟ پێناسەکەم لە گیرفانی ئاوارەکانی سەرکەژەو
ناو نیشانم
شاعیرێکی شێتەو دڵدارە شەیداکەی لێ ون بووە
عاشقی رووناکی خۆرەو لە زیندانی تاریکیدا رەشمالیان بۆ هەڵبەستووە.

سالی ۱۳٤۳ لە سەقز لە بنەماڵەیەکی ئایینی و هونەردۆستدا چاوی بە سەر دونیا دەکاتەوە. هەر لە منداڵییەوە ژیانی بە هۆی کاری بابیەوە بە گەڕان بە شارو گوندەکانی کوردستاندا دەست پێدەکا. حەزێکی نەناسراو لە دەروونیدا هانی دەدا بۆ لای شیعرو ئەدەب. لە ۱۹ ساڵاندا پاش ئەوەی کە کوسپێک لە ژیانی هاوبەشیدا پێک دێت، زۆرتر هۆگری شیعرو ئەدەب دەبێ و ئەزموونی شیعری خۆی دەست پێدەکات.

پاش ئەوەی لە خوێندن دەبێتەوە لە بەشی کوردی رادیۆ سنە وەردەگیرێ. کار لە رادیۆ سنە هەلێکی باشی بۆ ژیلا رەخساند تا دەگەڵ زۆر لە مامۆستایانی زمانی کوردی وەکوو حەقیقی، هەردی، ئاوات و ... ئاشنا بێ و ئەم ئاشنایەتییە کارێکی زۆری کردە سەر شیعرەکانی؛ هەر چەن دەستی ئەجەل ماوەی پێ نەدا بگات بە دوندی ئاواتەکاتی، بەلام لەو ماوە کورتەشدا توانی چێژی زۆر وەربگرێ و بگات بە ئاستێکی شیاو.

بە داخەوە سالی ۱۳۷٥ ک.هـ لە کاتێکدا کە تەنیا ۳۲ بەهار لە ژیانی تێپەڕیبوو، دەستی ئەجەل گوڵی ژینی چنی و بۆ دیاری خامۆشانی بەڕێ کرد.

بەرهەمەکانی ژیلا ئەمانەن:

- گەشەی ئەوین، شیعر، چاپی سنە، ۱۳۷٤.
- قەلای زار، شیعر، چاپی تاران، ۱۳۷۷.

ئەمانەش چەن بەرهەمی ناتەواوین:

١) کومەڵێک شێعر بو منداڵان .

٢) وەرگێڕانی چەند شێعرێکی فروغ فەروخزاد بە کوردی.

٣) وەرگێڕانی کومەڵـە شێعری بیژەنی جـەلی بـە کـوردی بـە نـاوی « روزنەها».

٤) چیرۆکێکی فارسی بەناوی «بر باد رفته».

٥) وەرگێڕانی چیروکـی «طلـب مغفـرت» لـە سـادیق هدایـەت بـە نـاوی «داوای لێبوردن».

٦) «دەروونناسی منداڵ» وەرگێڕاو لە فارسیەوە بو کوردی.

## قەڵای راز

بەسیە ئیتر بزە و کەنین تیلەی نیگا
سەد ئەوەندە نازداربیت و
ریک و پێکی بەژن و باڵا
دڵم بیا
هەرچەندە بێیت
هەر چەن برۆیت
چەن سەیرم کەی
بە وشەی جوان دڵم ببەی
تەنیا درزێک چکۆلانەش
ناکەیتە نێو قەڵای رازی
بە کلیلی کەسێکیکە داخراوم
قەد ئەم رازە نادرکێنم
پێت ناڵێم چەند خۆشتم ئەوێ
ناتوانم... نا
هەرچەن دڵم
هێندەی نەماوە شەق بیا
ئەی شۆرەسوار
بەیانی دێیت
بە باوەشی خۆشەویستی
دارستانێکی نیگاوە
دێینەوە بۆ دۆزینەوەی
ئەو مەلە پڕ لە ئەوینەی
لە ژوورەکەما جێ ماوە

کاریشت بەو دڵە شێتەی
لەگەڵ سیگار و شەمچەکەت
لە گیرفانی کۆتەکەتت خست
نەداوە

٧٤/١/٢٤

**گەشەی ئەوین** ........................................

لە خۆرەتاوی گەش وایە
دڵی ئاسمان بە تەمایە
لەبەر ئەوە بەر بەیانان
کە پێڵووی چاوی هەڵدێنێ
بەرەو ئامێزی شەو گرتووی ئاسمان ئەفڕێ
گەورە ئەبێ و
باڵا ئەکات
بەربەرۆژەی عاشق بە تاو
چاوی بڕیوەتە هەتاو
بە چوار دەوریا سەما ئەکات.
کێو سەربەری هەڵۆکانە
بۆیە لەبەر باو بۆراندا چۆک دانادات.
ئەی خۆرەتاو، زەریا، کەژان
لەو کاتەوە دڵم ئەوینی ناسیون
چاوی هیوای تێبڕیون
بۆ لاتان دێ و هاوار ئەکات
چۆک بۆ خەفەت دانادات و
هەڵۆکانی لە خۆی ناکات.

## سەمای مەرگ

باوەشم کرد بە باڵای خەمەکانداو
توندتوند بە خۆمەوە نووساندن
یەکە یەکەی ئەو خەمانە باسی تۆیان بۆ ئەکردم.
ئەوەی کە باسی کوێر بوونی چاوی کردی
ئەوەی کە باسی تینوویەتی ئاوی کردی
ئەوە وتی:
سووتای، سووتای، رەش هەڵگەڕاو
لە مێژوودا وەک تانە، وای
بە نێو چاوی جەلادەوە
بۆ ئەو کەسە خاوەن بیرە
ئالای... ئالای
دوایین کاتی هەڵقرچان و هەڵلەرزین و سووتان گەیشت
باوەشم توندتر کردەوە خۆشم سووتاند.
خەمەکانم بەسەر کلۆ خەڵووزی لەشما
سەمای مەرگ و کۆڕی شیوەنیان ئەگێڕا
بڵێسەیان ئەخستە نێو دارستان و
لەو دەمەدا -ئەریَ ئەریَ- لەو دەمەشدا
خێرا خێرا مژدەی بەیانیان ئەهێنا
بۆ حەڵەبچە

## ئامۆژگاری

لەو کاتەدا شۆخە کچێکی نازدارت
کرد بە بووکی ناو ژوورەکەت

دەخیلت بم، ئاگات لێ بێ
بۆنی پەنجەکانم نەکات، لە گوڵدان و لەسەر تاق و
پەنجەرەکەت.
کە پێی وتی:
«بۆنی گوڵێکی هەڵوەریو دێتە لووتم»
بڵێ: «گیانە! دڵنیابە جگە لە تۆ،
گوڵێک نیە لەم جیهانە».
نەکەی ناوی من بهێنی
بەختەوەری لە ژوورەکەت بتۆرێنی
ئەگەر هاتوو ژنێکت دی
بەژنی بەخەم داپۆشیوە
چاوانی کز و خەمبار
لێوەکانی وشک هەڵگەڕاو
بەشێوەیا یادت کردن
دانەچڵەکی
نەڵێی وێنەی ئەم هەژارە
لە ئەلبۆمی رابردووما یادگارە.

**سێ تار**
دڵی تەنگم سێ تارێکە
کاتێ پەنجەی خۆشەویستیت
تاڵی کەزیەی تاسەکانی ئەبزوێنێ
لەو ساتەدا، یادی دووریت
دڵی ماندووی ئەلەرزێنێ

کێ ئەزانێ؟

**کە خەو بە تووە ئەبینم** ........................................

-١-

خەو ئەبینم
دەستم ئەگری و لە تۆفانی سەرسامیدا
بەرەو کەنار ئەمڕفێنی
بۆ بەیانی
خۆت تۆفانی

-٢-

لە خەوما تۆ
کوردە بالا بەرزەکەیت و
دەس هەڵئەبڕی
لە باخەکەی دراوسێشتان
سێوێک ئەدزی و ئەیدەی بە من
دائەچڵەکێم
باخەوانێکی تووڕەیت و
سێوەکەت لێ دائەشارم

-٣-

هەرچی شەوە تۆ پاڵەوانی خەوەکان
تۆ ئەستێرە و شاخ و ئاسمان
جوانی و بزە و میهرەبانی
بۆ بەیانی...؟

دەمێک بوو هەوری سەرشێتی هونراوەم
وەک پەیکەرێکی مانگرتوو
چاوی بڕیبووە بەستەڵەکی سەختی زستانی ئ ...یی ماندوو
ئێستا لە جیهانی دڵما فیستیڤاڵی هۆنراوەی ئاگرین و
شیعری ئەوین
سەرچۆپییان دابەستووە
من چیم جگە لە شاعیرێ؟ پێناسەکەم لە گیرفانی ئاوارە... ...کەژەو
ناو نیشانم
شاعیرێکی شێتەو دڵدارە شەیداکەی لێ ون بوو
عاشقی رووناکی خۆرەو لە زیندانی تاریکیدا ڕە... هەڵبەستووە.

## جادووی حەنین

گەرچی ڕۆژم لە بان سەکۆی ماڵەکانی نیشتمانم
تەمەنێکە لە چاوەچاو
زیندانێکە لە خەونی سەوز
ژوانێکە لەگەڵ حەزو تاسەی ڕاماو

گەرچی شەوم لە کۆڵانی شارەکانی نیشتمانم
ئاسمانێکە ڕەش داگەڕاو
شەرمن بە ماچی ئەستێرە
نامۆ بە خەرمانەی مانگ و تیشکی هەتاو

گەرچی زەمان لەسەر کوڵمی کێوەکای نیشتمانم
فرمێسکێکی قەتیس ماوە
نیگایەکە ئەسیری چاو
ڕووبارێکی ڕاوەستاوە

گەرچی مێژوو لە بن دارو بەردەکانی نیشتمانم
جۆگەی ئارەقە و خوێن و نان
ڕێچکەیەکە توناو تون وێڵ
یاداشتێکە پڕ لە گومان

گەرچی، گەرچی، گەرچی بەڵام
تروسکەیەک لە نیگاما
چەخماخەیەک لە ناو دڵی بەهیواما

لە شلخەوە تا شۆ

بۆنیک لە ئەشق لە ناو باخچەی تەمەنناما
بانگم ئەکەن بۆ باوەشی ئەم دۆزەخەی بەهەشتی من
لوولم ئەدەن بۆ گێژەنی خەیاڵی ون
بە گوڵاوی ئەشقی شیرین
مەستم ئەکەن
بە زنجیری جادووی حەنین
دیلم ئەکەن
وێڵم ئەکەن
بە سەرابی خەونی رەنگین،
ئەم جادووەی ئەشق و حەنین
جادووی حەنین
گەرچی رۆژم لە بان سەکۆی ماڵەکانی نیشتمانم
تەمەنێکە لە چاوەچاو
زیندانێکە لە خەونی سەوز

# چۆمان هەردی

چۆمان هەردی لە باشووری کوردستان چاوی بە سەر دونیا کردۆتەوەو تا تەمەنی ١٤ سالان هەر لەوێ ژیاوە. بە هۆی کیمیابارانی کوردستان بنەماڵەکەی هەڵدێن بۆ ئێران و پاشان دەڕۆن بۆ تورکیاو ماوەیەکیش لەوێ دەبن. لە ١٩٩٣دا بارگەی ئاوارەییان لە بەریتانیا هەڵدەدەن.

پاش ڕۆیشتن بۆ بریتانیا لە کولیژی کوێنی ئۆکسفورد، فەلسەفەو دەروونناسی دەخوێنێ. لە زانکۆی لەندن ماستەری (فوق لیسانس) فەلسەفە وەردەگرێ. چۆمان کە وەکوو خاتوونێکی کورد دەردو ئازاری ژنانی کوردی بە دڵ و گیان هەست پێکردووەو هەردەم لە بیری سارێژی ئەم دەردەدا بووە، نامیلکەی دوکتوراکەی لە سەر «گیرو گرفتە دەروونییەکانی ژنانی کورد» لە زانکۆی کێنتدا نووسیوە.

هەندێ لە بەرهەم و چالاکییەکانی ئەمانەن:

- دوو کۆمەڵە شیعر بە ناوی «گەڕانەوەی بێ بیرەوەری» دانیمارک ١٩٩٦، ڕووناکی «سێبەرەکان» سوید ١٩٨٨.
- دیوانە شیعرێک بە زمانی ئینگلیزی ٢٠٠٤.
- مامۆستای پەروەردەی شیعری ڕێکخراوی «جیروود-نارڤن» لە ساڵی ٢٠٠٣.
- سازدانی کورسی ڕاهێنانی شیعر بۆ بریتیش کاتسل.
- سەرۆکی کومیتەی نووسەرانی مەنفا (Exiled Writer's Ink).
- چۆمان لە ساڵی ٢٠٠٢ دا بۆ خەڵاتی «ئارت فاوندیشین» ناوزەد کرا.

**پەسەند کردن**

بیرمان نەچێ بۆ گوڵەکان
بڕیاریان دا ئەو بارانە نەخۆنەوە و
لە باتی، پیر بوونی خۆیان هەڵبژارد
بیرمان نەچێ ئەستێرەیەک بۆ ئاسمانی بە بریقەی نیوە شەوی
بەجێهێشت و لە تەنیایی و بێدەنگیا ڕۆحی سپارد
بیرمان نەچێ خۆر و مانگ بۆ لێک عاجز بوون،
شەو و ڕۆژیان لە نێو خۆیاندا دابەش کرد.

بەردەکان تاوانبار نەکەین بۆ بێدەنگی و مەتینیان
جۆگەکان تاوانبار نەکەین بۆ بێ سەبری و شێتێتیان.
بیرمان نەچێ دڵخۆشی شاخ بدەینەوە کە بە دوای هەورێکدا دەگری.
دەبێ فێر بین ڕەنگە جیاکانمان خۆشبوێ.

**مەستبوون**

ئەی ڕووناکتر لە خۆرەتاو
بە تریفەتر لە مانگەشەو
دڵم دەخەمە دەستمەوە و
دەستم دەخەمە دەستتەوە و
لەگەڵتا دێم
ئەی شەراب و ساقی هەموو پێکەکانم
تۆ پێم بڵێ
بەم حەیرانی و بەدەمەستیە بۆ کوێم دەبەی؟
ئەی هاودەمی گۆشە تاریکەکانی ڕۆح

ئاشناتر بە مەیلە شێتەکانی دڵ
دڵم دەخەمە دەستتەوە
ئەی ڕووناکتر لە خورەتاو
بە تریفەتر لە مانگەشەو
دەستم دەخەمە دەستتەوەو
بۆ کوێ بڕۆی لەگەڵتا دێم.

**بێدەنگی**

بۆنی کۆتاییەکان دەکەم
بۆنی سستی وشەکان و
تەواو بوونی گفتوگۆکان
بۆنی مەرگ
مەرگی پەپوولە شینەکان
بۆنی کۆتاییەکان دەکەم.
تەمەن ڕەنگە شوێنێک بێ بۆ قسەکردن
تەمەن ڕەنگە شوێنێک بێ بۆ
بەکارهێنانی وشەکان
گوێ ڕاگرتن لە وشەکان
تێکەڵاو بوون بە وشەکان
تەمەن ڕەنگە
کوشتنی بێدەنگیەکان بێ.
بێدەنگیەکان
ڕەنگە مەرگی ژیانمان بن.
بۆنی کۆتاییەکان دەکەم

بۆ قەبر
بۆنی نەبوونی بەهەشت و
بێدەنگی جەهەنەمەکان
بۆنی تەنیاییەکان دەکەم.

**ئاشنا بوون**

لە رووناکی چراکەدا
سێبەرەکانی شێوەی ئەو
چ نووریێکیان لێدەبارێ!
دنیا چییە
جگە لە ئاشنابوونی دوو بێگانە و
بێگانە بوونی دوو ئاشنا!
ئەی بێگانە!
سێبەرەکانی سەر شێوەت،
وشەکانت، جگەرەکەت
ئاشناییان لێدەتکێ
ئەی ئاشنا!
نامۆبوونمان لە یەکتری،
بێگانە بوونی ئەبەدی،
هەر زۆر زوو دەسپێدەکا.
دنیا چییە
جگە لە نەهاتنەدی
یان بەسەقەتی هاتنەدی
خەونەکانم؟

خەڵکی شاری سلێمانی و نیشتەجێی سویدە. تا ئێستا توانیوە بە نووسین لە بواری جۆراوجۆری وەکوو رەخنە، وتار، لێکۆڵینەوە، وەرگێران (لە فارسی، سویدی و عارەبییەوە)و شیعر خزمەتی کتێبخانەی کوردی بکاو کوڵی دڵی خۆی دامرکێنێ.

دلاوەر یەکێک لەو نووسەرانەیە کە لە بواری جۆراوجۆردا خاوەنی گەلێک بەرهەمی بەرچاوو بە نرخە. ئەمانەش هەندێ لە بەرهەمەکانی دلاوەرن:

- هەشتەمین سەفەری سەندیباد،
- زستانە خەون،
- گورگە خان،
- دوو دنیا (وەرگێران)،
- جێگایەکی تر،
- شەڕ، شانۆنامە (وەرگێڕان)،
- گەمەی پاکیزە، شانۆنامە (وەرگێڕان)،
- ژووری ژمارە شەش، نووسینی چێخۆفە و دلاوەر کردوویە بە شانۆنامە،
- کوێرەکان، شانۆنامە (وەرگێڕان)،
- رەنگی خۆڵ، شیعر،
- تەیرەکانی ئیسماعیل، شیعر،
- و ... .

دلاوەر قەرەداغی

**لە چاو ترووکانێکا سەری ولاتم سپی بوو**

ئەو ئێوارەیە
میلی کاتژمێر بیست و پێج جار
بە نێو تەمتومانی شپرزەیی رۆحی ئەوا فڕی
ساڵ بووە پێنج وەرز
بەهار، هاوین، پایز، هەڵەبجە، زستان
خۆر سەری ئاوابوونی لێ هاتەوە یەک
لە چاوترووکانێکا سەری ولاتم سپی بوو
ئەی تاسەی تەڕوبڕی یەکەمین ویساڵ
ئەی قاسیدی بەویقاری سەرەتا!
خۆت لەوێ بووی
کە بادی خۆشمروور هەڵیکرد و
ئەو سیروانی سیاچەمانەیەمی
بۆ هیجرەتی دیاری غەریبی هەڵپێچا
بە باڵی هەنگاوت هەڵمگرە ئەی پەیکی شارەزا
توند توند لە مەوجی تەڕوبڕی روانینتم بپێچە
تا لەسەر لەپی ئیشتیاقت سەوزبم
هەڵمگرە ئەی بادی سەبا
لەسەر لەرەی دەنگت
تا لە شوێن پێی سەرابی هیجرەتتا
باڵ بگرم
هیجرەتە... هیجرەتە... هیجرەت
هیجرەتی شار و شیعر و شنروێ
هیجرەتی هەڵەبجە

ئەوەتاین، بمانبە
لەسەر شاباڵی هیجرەتت هەڵمانگرە
هێند هاتووینەوەیەک
لە جانتای مەکتەبی منالێکا جێی هەموومان دەبێتەوە
ئێمە ئەمێستا خەمێکین ساڵخوردە سپی سپی ئەچینەوە
ریز ریز بەو رێیەوە
ئەڵێی بەفرین لە کاتی بارینا
ئەڵێی چاوین لە کاتی روانینا
ئەڵێی باڵین لە کاتی فڕینا
ئەڵێی پەلکە سەوزەکانی کانی ئاشقانین
لە کاتی ژاکان و وەرینا
بڕوانە ئەی پەیکی شارەزا
ولاتم چنگێکی ماوەتەوە
بمانبە سوودی نیە نامە
تەشریحی زەعیفی من و
غەمی ردێن سپی هەڵەبجە نایەتە تەحریر
هەڵمانگرە نەرم نەرم لەسەر باڵی هاژەت
ریزریز لە گوڵدانی بەر پەنجەرەی نەخۆشخانەکانی
تاراندا
بمانڕوێنە
توندتوند لە خوڕڕەی جاری «فیراق»مان بپێچە
تا لەسەر لەپی ئیشتیاقت سەوزبین
لەوا بوویت ئەی پەیکی شارەزا
ئەو رۆژەی جێ کەڵبەی ژەهراوی گورگ

به جەستەی کارئاسکەکەی سەحرای
هەڵەبجەمەوە بەجێما؟
ئەو ڕۆژەی «گولان» دڵی تێکەڵهات و
«سیروان» لە پێ کەوت و
مێژوو ڕشایەوە؟
لەوا بوویت ئەی پەیکی شارەزا
ئەو بەهارەی نێرگز
چلە چلە سنگی خۆی دادڕی و
«دیوان»م پەڕەپەڕە خۆی کوشت و
«قەسیدە»م بەیت بەیت سەری هەڵگرت
ئەو ڕۆژەی شاخ گریا و
کانی قوڵپ قوڵپ زریکانی و
گولان هێشو هێشوو وەرین
تەنانەت تۆیش ئەی بادی خۆشمروور
فریای خوێندنەوەی ئەو چامە سەوزەی
هیجرەت نەکەوتیت.
چنگێ هەناسە- ئەی بادی سەبا!-
بۆ هەنگ بۆ هەڵەبجە بۆ هێرۆ
تۆزێ جریوە ئەی بادی سەبا!
بۆ گەلا بۆ گوڵ بۆ گڕە گاڵ
هێندەی سەردەرزییەک نیگا ئەی بادی سەبا
بۆ هیجرەتی ناوەختی ئاوێنە و چرا
لە جانتاکەتا جێمانکەرە و
توندتوند لەسەر هەناسەو هەوارو هەور دامانخە

پەلک پەلک روانینمان
لە ئاسمان و زەوی و کتێبەکان هەڵکێشە
تاڵ تاڵ رەگمان
لە گۆرانی و حیکایەت و تابلۆکان بکەرەوە
ئێمە قەبیلەیەکی گوناهـ بووین... گوناهـ

**منالێ کە لەوێ هاتەوە وای وت**
ئەنفال لەرێی چوونە ژواندا رای گرتین
گیرفانەکانمان گەرا نامەکانی دراند وێنەکانی
سووتاند
گۆرانییەکانی لەسەر دەنگمان کلۆم دا
ئەنفال بەیانی باشی مەکتەب و
ئێوارە باشی گەرەک و
شەوباشی ماڵە لۆکەییەکانی دزی
ئەنفال سلاوی لە لێوی عاشقان رفاند
گوڵی بەر یەخەی گۆرانییەکانی مامڵێی ژاکاند
سیاچەمانەی نێو گەرووی کاکەمەمی تاساند
ماڵە باجێنەی ژیکەڵەی خاتوو زینەکانی رووخاند
ئەنفال ناوەخت خۆی کرد بە ژوورا
ئێمە نانمان ئەخوارد
خوانێک لە خۆشەویستی کۆی کردبووینەوە
ئێوارانێک لە دڵنیایی خۆی هەڵئەسوو
لە برینەکانی دوێنێ
شەوانێک لە میهر لەودیو پەنجەرەکانەوە

فیکەی ئەکێشا
ناکاو چراکان کوژانەوە
ئێوارە دای لە شەقەی باڵ و فڕی
شەو زریکاندی و
خۆر دوامالْ ئاوایی لە سنەوبەرە سەوزەکانی
بنار گوند کرد
وای ئەنفال داری بەسەر بەرد و
منالی بەسەر گڕ و گاڵ و
درەختی بەسەر جریوە و
ئاسمانی بەسەر ئەستێرە و
گوندی بەسەر شاخ و
رووباری بەسەرهاژەوە نەهێشت
وای ئەنفال درەختەکانی فریودا
خۆی بۆ راوکردنی مانگ نایەوە
هەنگەکانی ژەهرەخوارد کرد
رێ و بانەکانی بە مین کێلا
دەستی نایە بینی گوڵەگەنم
ئەنفال وتی چ نیە منالینە
سەفەرێکە و دێنەوە
ئەنفال وتی: ئەچین بۆ سەیران
هەر بەرێوە دوو گوندی بە سەوزی داکرماند
هەر بەرێوە نامەکانی دڕاند
هەر بەرێوە وێنەکانی سووتاند
سلاوی لە لێوی منالان رفاند

ئەنفال درۆی کرد، سەیران نەبوو
تاریکستان بوو تاریکستان
١٨٢ هەزار نیگا هیچمان ئەوی ترمان نەئەدی
بەلام گوێمان لە ترپەی دلی یەکتر بوو
ئەنفال هەموومانی ئەدی و
ترپەی دلی هیچ کاممانی نە ئەبیست.
ئەنفال چاوی بە پەڕۆیەکی رەش بەستین
بە بزەیەکی گالتەجارییانەوە وتی:
منالینە چی ئەبینن؟
وتمان: هیچ، جگە لە تاریکستان هیچ.
ئەنفال ئاسمانی لەسەر داخستین
زەوی لە ژێر پێمان پێچایەوە
ئەنفال جیای کردینەوە ریزی کردین
وتی: دەستتان بگرنەوە منالینە
بە دارحەیزەرانێک ١٨٢ هەزار داری
لە دەستمان سرەواند
پەنجەکانمان وەرین
ئەنفال چاو و هەناسەمانی پڕ کرد لە خۆڵ
داری بەسەر بەرد و هیچی بەسەر هیچەوە نەهێشت
ئەنفال وتی: منالینە سەیر کەن چی ئەبینن؟
وتمان: جگە لە سەحرا هیچ.
ئەنفال درۆی کرد جگە لە سەحرا هیچمان نەدی
تەنها گوێمان لە ترپەی دلی خۆمان بوو
کە مردین.

## ئەمین گەردیگلانی

شاعیرو نووسەرو وەرگێڕ لە ساڵی ١٣٤٩ لە گەردیگلانی سەر بە شاری بۆکان هاتۆتە دونیاوە. دەبێ بخرێتە ریزی ئەو نووسەرانی پڕکارەوە. تا ئێستا توانیویە چەندین بەرهەم پێشکەش بە قوتابخانەی کوردی بکات و ئەوەی لە دەستی هاتووە بۆ پەرای زمانی کوردی درێخی نەکردووە. لە بەرهەمەکانی ئەمین دەتوانین ئاماژە بەم کتێبانە بکەین:

-تاپۆی وەرزێکی سەوز، کۆمەڵە شیعر.
-شەوە ژانی ئەستێرەیەک، دیوانی شیعر.
-مەرگە خەون، شیعر.
-برایانی کارمازۆف، وەرگێران، رۆمان.
-جێگـــای بەتاڵـــی سلووچ، وەرگێران، رۆمان.
-دیسان لەو شەقامانەوە، وەرگێران، رۆمان.
-تەپڵی ئاور، وەرگێران، کۆمەڵە چیرۆک.
-... و چەندان بەرهەم و دیمانە و وتاری تر.

## نیو نیگا

ئەی شاکچی نازەنینی
شاری حەز و خەونەکانم
کە پەنجەی گەرمی نیو نیگات
پەردەی پرتووکاوی لەسەر
گلێنەی پەنجەرەی دلم هەلدایەوە
بە تیشکی زەردەخەنەیەک
زوقم و شەختەی خەمەکانم توایەوە.

بەهاری ١٣٧٣

## ترس

کانییەکی چاوشینم دی
خۆی لە چنگی زبری خاک
رادەپسکاند و
بە سلۆکی ریی دەپیوا،
دوای چەن هەنگاو
کە خۆر نوقورچکێکی دەگرت
لە رانە رووتەلەکانی،
هەلمی شەرمێک دایدەگرت و
خۆی دەخزاندەوە ئامیزی
خۆل و بەرد و خیزەلانی

زستانی ١٣٨٠

## مینی تەماتەیی

بلێی هەتاو سیلەی چاوێ بە سەر ئێمەشدا بگێرێ
خوێنی سەوزی هەناسەی ژین

بە جۆگەی لەشدا بگێڕێ؟
لە نێو تەوژمی دووکەڵا پشووی سوارە پیرە ئاسمان
کوا دەتوانێ زەویی کرمۆڵ لە نێو باوەشدا بگێڕێ؟
تاکوو ژیانەوەی پشوو
تاکوو روانەوەی ئاور
شەماڵ رۆحی بە شوێن شنەی بووژانەوەشدا بگێڕێ.
هێشتا هەناسەی خنکاوی ئەم خاکە رەق هەڵاتووە
ناتوانێ جارێکی تر چاو بە رۆژی گەشدا
بگێڕێ.

***

مینی تەماتەیی ویستی بە پڕیشکە شەونمی خوێن
روخساری بۆر و دزیوی خۆی ئاڵ و گەش دابگێڕێ.
ئامێزی دووکەڵینی بۆ هەنگاوی ژین ئاوەڵا کرد
تا دنیایە دەبێ گرمەی بە دوای تەرکەشدا بگێڕێ.
تاکوو کۆیان بکاتەوە و دەسنوێژێکی سوور هەڵگرێ
سوجدەی رەشی بە دووی رووگەی
خوێنی دیکەشدا بگێڕێ

***

خوێن بپشکوێ، خۆر دەپشکوێ.
باران و بەفر دەپشکوێن
با دووکەڵ بۆنی بارووتی
بە شوێن بارەشدا بگێڕێ
گوڵ ئەستێرەی خوێنی هەڵۆ
چاوی وە شەوارە دەخا،

شەوی چڵکەسوو بیهەوێ زەردەپەڕ رەش دابگێڕێ.

زستانی ١٣٨١- بۆکان

**ریگا**

پشتی ریگا
هەرەسی هەزارەی خوین و
گڕی بەسەردا رووخاوە
پەنجەی تۆزاوی گەردەلوول
-لە سەر تاری دلی زەوی-
هەڵدەپەڕێ بە تەوژمی رەشەباوە
بەیانی شار:
لەش داتەپیو
هەناسە سوار،
ئەژنۆ لەرزۆک
سەری کاسی داخستووەو
باڵتەی تەم و دووکەڵێکی
خەستی بە شانیدا داوە.
مێشکی بۆتە کەرەسیسە و
هەڵ
دە
وە
رێ
چاوی پرووش و بێ سۆمای
لەسەر سنگی
چەن ساتێکی

بۆگەنیو و
قورماوی لێ بەجێماوە.
چزووی ماری شەقامی شار
شەوکوێرانە
لەگەڵ هەموو چرکەیەکی
تەمەنی شەرماوی شەودا
بە گلێنەی کانی چیا و
مەمکی شلکی
گوڵە گەنمیەوە داوە.
ڕێگا
ڕێگا
لەو کاتەوە زەوی هەیە
خەو لە چاوانی
زڕاوە.
ڕێگا
ڕێگا
لە نێو جەرگی
سڕی هیچ شەوەزەنگێکا
دڕکی وەنەوز
لە بیلبیلەی سەوز و گەشی
نەچەقاوە.

## سیمین چایچی

لە شاری سنە هاتۆتە دنیا، یەکێک لەو ئافرەتانەیە کە لەو دەمەیرا خۆی ناسیوە هۆگری شیعرو ئەدەب بووە. شیعر لە لای سیمین نەک هەر بۆ دامرکاندنی کولی دل، بەڵکوو شیعر ئامرازێکە کە دەتوانێ تێیدا خۆی و هەموو ژنانی کوردستان بناسێتەوە.

سیمینی چایچی یەکێک لە چالاکانی مافی ژنانە لە کوردستانی ئێراندا و لەم ڕێگایەدا گەلێک هەولی داوە و دەیان وتار و نووسراوەی لە ڕۆژنامە و کۆڤارە جۆراوجۆرەکاندا چاپ کراوە.

**پارادۆکس**

گەرچی دەمێکە بێ بڕوام
بە هەرچی عێشقی خاوێن و رومانتیکە و
پێئەکەنم بەم قسانە
بەڵام جارجار
دێ بە سەرمدا
وشەی سیمین بکەمە شیرین
فەرهادێ لە شیعرەکانما بخولقێنم و
سەرشێتانە بیخەمە ناو
بازنەی ئەوین
ئینجا
جوان جوان
وەک هەمیشە
خۆم فریو دەم
سەرخۆشانە بزریکێنم :
خۆشەویستی ڕاستە
ڕاستە
ئەرێ ڕاستە.
گەرچی دەمێکە بێ بڕوام
بە قوربان قوربان و قسە
بەڵام هەر هیچ نەبێ ژنم
ژنێکی رووت
لە جنسی با
سەردم

گەرمم
سەختم
نەرمم
گاه شەرمنتر
لە کچێکی لادێی و
گاه
تا ڕاهاتن بە جورمی
خۆسپاردن
سەیرو بێ شەرم .
ساڵهایە
سەودای خۆشەویستیەکی
هەتاهەتاییم لە سەرە
اممم
ئەی بۆم نابێ؟
ئەوە هات و ...
لە دووی گەڕام .
ئەوە هات و
لە ژێر چە قوی تیژی سانسۆر
خۆم دەرباز کرد .
ئەوە هات و
کەسایەتیە دەستکردەکەم
یەکسەر رووخاند .
ئەی دلەکەم چی؟
چی لێ بکەم ئەو

زمان نەزانە؟
بە خورپەخورپ
واز ناهێنێ
وەڕەسم ئەکا و
تا خولیای عێشق
ئەمگەوجێنی
دەڵێم لە جێ
هەموو ژنێک
ئاشق بم و
بە بە ژن وباڵای پیاوێکا
هە ڵبەستێنم
جنێوی پێبەم
پەرەستێشی کەم
بیکەم بە خودا و ئەهریمەن
بە زمان بڵێم :
بڕۆبڕۆ
بە چاو ئاماژە
وەرەوە.
دەڵێم
لە جیاتی هەمویان
ژنانە بازی دەربێنم
پیلانی ناسک دارێژم
ئێڤەی داوین پاکی بکەمە
مانیفێستێ بۆ دڵبەری .

لە جیاتیان

بڕوێنم

بڕۆخێنم

بخولقێنم

بەڵکوو

دڵە نەفامەکەم لە ڕوو بچێ.

دی واز بێنێ

نەک جارێ تر

بمگەوجێنێ.

٢٠٠٧/٤/١٥

**غوربەت**

ئەبمە دڵۆپێ حەسرەتی ئازار

لە وەرزی چاوی غوربەت دێمە خوار

ئەبمە ناسنامەی ژنێکی عاشق

بێزووی بە خاکی وڵاتەو دیدار

ئەبمە هاوکۆچی پەڕەسێلکەکان

ئەگەڕێمەوە بەرەو کوردستان

لە چوارڕێیانەی مان و نەمانا

ئەبمە خاڵێ سوور لە نەخشەی جیهان

پێکەرەی پاکی ئەوین ئەنێژم

فرمێسکی تاڵی تاوان ئەڕێژم

گەر خۆشەویستی تاوانبارییە

لێوانلێوی تۆم لە تۆ سەرڕێژم

من دارەوەنی ئاشنای کوێستان

ریشەم جێ ناگرێ لە غەریبستان
ڕۆژێکم ماوێ لەسەر دنیاوە
ئەگەڕێمەوە بۆ ناو دارستان

پاییزی ٢٠٠٠

**هاوسەفەر** ........................................................................

وەک هەناسەم لێم نزیکی
بەڵام دووری وێنەی ئاوات
وەکوو عەشقە باڵا ئەکەم
لە دەوری نەمامی باڵات
هاوسەفەر، هاوسەفەر، هاوسەفەر، هاوڕێم!
کام نەیارێ بوو بە یارت؟ کێ نیشتە جێم؟
هەستت ئەکەم تا شاری بوون
لێم نزیکی هەر وەکوو خۆم
گەر ناتبینم هەستت ئەکەم
ئەتۆ منی، منیش هەر تۆم
هاوسەفەر، هاوسەفەر، هاوسەفەر، هاوڕێم!
کام نەیارێ بوو بە یارت؟ کێ نیشتە جێم؟
ئادەی ئادەی بیشکێنین
قەڵای شەرم و لۆمە و یاسا
با تێکەڵ بێ هەناسەمان
ئازاد بین لە داوی دنیا
هاوسەفەر، هاوسەفەر، هاوسەفەر، هاوڕێم!
کام نەیارێ بوو بە یارت؟ کێ نیشتە جێم؟

سلێمانی- بەهاری ٢٠٠١

## شارەکەم

باوەڕت بێ دوور لە تۆ دوورم لە خۆ
دوور لە تۆ، دەردی گرانم دێتە سۆ
باوەڕت بێ، بێ تۆ لێڵە چاوەکەم
ناوەکەت ناسنامەیە بۆ ناوەکەم
هۆ سنە هۆ شاری سەوز و بەرزەناو
تۆزەکەت ئەمباتە بەر مالی هەتاو
دوور لە تۆ دوورم لە یار و ئاشنا
کێو و کۆلان بۆنی مۆنی خاک ئەدا
دوور لە تۆ بێرەنگە شێوەی شادی یار
ناسرەوێ هەستم لە هەورازی بەهار
هۆ سنە هۆ شاری سەوز و بەرزەناو
تۆزەکەت ئەمباتە بەرمالی هەتاو
کۆنە ئەلبوومی ژیانم، کۆنە یار
وێنە هەڵگری غەمی یار و نەیار
ئەوەڵین ئێستگەی ئەوەڵ هەنگاوەکەم
ئاخرین وێستگەی دلە بێتاوەکەم
تۆزەکەت ئەمباتە بەر مالی هەتاو

سنە- بەهاری ۲۰۰۱

## یاخی

من ئەو گوڵە نیم کە ریشەم لە خاک گیر بێ
سەرم سەرسەوز و گەش، پام بەندی زنجیر بێ
لە قاپی پەنجەرە دڵ بەرم لە رێبوار
بەڵام دڵەکەی خۆم، لە زووری ئەسیر بێ

ئەگەر رۆژێ دەستێ نەبێ تێرئاوم کا
گەڵا گەڵای لەشم بژاکێ و پیر بێ
من ئەو گوڵە زیزەم کە گوڵدان ئەشکێنم
بێ پەنجەرە و شووشە باڵای خوم ئەنوێنم
من ئەو گوڵە نیم کە رازی بم بە گوڵدان
بە ژینێکی سادە، ئارام ئارام گیان دان
رازی نابم هەرگیز لە سێبەرا بمرم
دوور لە هەوای تازە، بێ عەشقی سەرهەڵدان
بێزارم لەم ماڵە، لە پەنجەرە و شووشە
سەفەرە ئاکامم، سەفەر بەرەو باران
من ئەو گوڵە زیزەم کە گوڵدان ئەشکێنم
بێ پەنجەرە و شووشە باڵای خۆم ئەنوێنم

سنە- پاییزی ٢٠٠٣

ساڵی ۱۹٦۷ لە شاری کەرکووک چاوی بە سەر دونیا کردۆتەوە. ساڵی ۱۹۸٦ یەکەم شیعری خۆی بڵاو دەکاتەوەو لەو کاتەوە خولیای شیعرو نووسین دەبێ. لە بوارە جۆاوجۆرەکانی نووسیندا وەکوو وەرگێڕان، لێکۆڵینەوەو پەخشان و .. ئەسپی قەڵەمی دەهاژوێ. لە ساڵی ۱۹۹۲ەوە دەڕواتە بواری ڕۆژنامەگەری و لەم بوارەشدا وەکوو هەموو جارەکانی تر سەربەرزانە لەم ئەزموونەشدا دەردێ و ئێستا لە ڕۆژنامەی کوردستانی نوێدا سکرتێری نووسینە.

خاوەنی ٦ بەرهەمی چاپکراوە کە ئەمانەن:

۱-بەندەری بەرمۆدا، کۆمەڵە شیعر-۱۹۹۹، چاپی یەکەم، لەبڵاوکراوەکانی زاموا وچاپی دووەم چاپخانەی دلێر.

۲-وتەکانی وتن، کۆمەڵە شیعر، ۱۹۹۹، ڕێکخراوی لاوانی میدیا TDC.

۳-قاوەیەک لەگەڵ ئەودا، کۆمەڵە شیعر، ۲۰۰۱، وەزارەتی ڕۆشنبیریی بەڕێوبەرێتی چاپ وبڵاوکردنەوە.

٤-ئاوێنەم شکاند، کۆمەڵە شیعر، ۲۰۰٤ ، وەزارەتی ڕۆشنبیریی بەڕێوبەرێتی چاپ وبڵاوکردنەوە.

٥-کتێبی ژن، کۆمەڵە وتار ولێکۆڵینەوە، ١٩٩٩ ، دەزگای چاپ وپەخشی سەردەم.
٦-ناسنامە بکوژەکان، چەند خوێندنەوەیەک بۆ ئینتیما و بەجیهانی بوون، (وەرگێڕان) نووسینی ئەمین مەعلوف، ٢٠٠٣ خانەی وەرگێرانی وەزارەتی رۆشنبیریی حکومەتی هەرێمی کوردستان.

**من دەبێ خۆم بسمیل بکەم**

**من دەبێت ساڵێک ئاوی ڕوون**
**لەسەر قاچ و قولم بڕوات**
**بۆئەوەی پاک ببێتەوە لە چڵپاوی**
**خاکێکی بێ مروەت.**

من دەبێ خۆم بسمیل بکەم
بە گوڵەسوورەی لادێیەکی دوور لەشار
بەئاوی کانییەکی سازگار
بەشیعری ئەی ڕەقیبی دڵدار.

خۆزگە بتوانم بەقوڵفی گۆزەیەکدا تێبپەڕم
بەڵکو پیسی ڕیاکاران لە پێستم داماڵرێت.

ئەوەی ماوە لە تەمەنم
بەشی ڕاوەستانم ناکات
لەبەر جوڕنەی حەمامێکی پڕ لەهەڵمی ژیاندا
تا دوا وسڵی بێنوێژی سیاسەت لەخۆم دەرکەم.

ئەوەی ماوە لە ژیانا
بەشی پاڕانەوەم ناکات لە خودا
تاکوو لە گوناهم خۆش بێ دەرهەق بە خۆم
ئەو کاتانەی
ئاوی دەریاکان دەڕێژم بەسەر خۆما و

دەڵێم خوایە
وسڵی نیشتمانپەروەریم دەردەکەم!

خۆزگە بتوانم ١٤ ساڵ لە گومڕایی
بە ڕیشە سپییەکەی باوکم
یان بە فەقیانەکەی دایکم بسڕمەوە!
وەک تەختەرەشی بێباکی قوتابخانە
لە بەری دەستم بنووسم
وانەی یەکەم.

چۆن ئەم زمانە شیرینە
لەناو جانتاکەی شانمدا بشارمەوە
بۆئەوەی تاڵ نەبێت؟
گوێچکەم بەمۆم سواغ بدەم
بۆ ئەوەی گوێم
لە دەنگی کەڵەشێرێکی نەزۆک نەبێت
کە پێی وایە ئەو نەبێت ڕۆژ نابێتەوە؟

من دەبێ خۆم بسمیل بکەم
بە گەڕاوەکەی ئەحماوا،
هەر وەک ئەوەی کە شوێنێکم
بەر شوێنی تۆپیوێک کەوتبێ
بەبێ خواستی خۆم دەڵێم: یاع

هەروەها بە چەشنی منالی
خۆم خۆڵ و خوێ و تاکەنەعلێکم دەهێنم
بۆ پیریژنی بچکۆلەی، مێخەک لەملی هاوسێمان
پێی دەڵێم: نەنە گیان! دایکم سەلامت لێ دەکا و
دەڵێت دەمی بکوتەرەوە
ماوەیەکە زۆر سەری کردۆتە گریان
بەڵکو ئیدی عاقڵ ببێت

لەئێستاشدا
تەرمی رابردوو دەشۆم و
وسڵی مردوو لە گیانم دەردەکەم.
لەبەر بارانی ئەویندا
فرینم تەڕ دەبێ و
بەهێمنی دەنیشمەوە،
بۆئەوەی بەزەمەن بڵێم:
ئایندەم خۆشدەوێت.

٩ی ٢٠٠٧ سلێمانی

**دڵم لەشوێنێ داناوە**

ببورە! من دڵم
لەسینەمدا نییە
لەشوێنێ دامناوە
نازانم لەکوێ !
تۆ دەچی
کتێبخانەی گشتی شاری بۆ دەگەڕێی

دەبینی خوێنەرێ
دەییات و نایهێنێتەوە.
ببورە! من وێنەم
لەسەر شۆستە و
لەسەر دیواری چێشتخانەکان و
لەچاوی کوراندا هەیە.
هێندە ڕەگی ناوبانگم ڕۆشتووە
زەحمەتە ملوانکەی پچڕاوی تەمەنم
تازە نەک تۆ
بەهیچ کەس بهۆنرێتەوە .
ناتوانی بیبڕیت زمانی درێژی
قسە و باس
مێژوو خولقێنێ بگۆڕی
بەدایکێ بۆ منداڵ
بووکی خەیاڵی بەسەدانیش بکەیتە
نیوەی خۆت و
هەرگیزیش پەشێمان نەبی
لەوەی کەشەرابی عیشقم دەخۆیتەوە.
ببورە! من چاوم
پڕە لەدابڕان
کەشەوان بەتەنیا دەنووم.
شیعرم تەژییە لە ژوان
بۆ کەسانێ نایانناسم
لێم گەڕێ

دلنیام ناتوانی
بەبێ ئەوەی، خۆت لێ ون بێت.
ونبوونم بدۆزیتەوە.

٢٠٠٧-سلێمانی

**مانگی شکاو**

هەشتەمین ڕۆژی تۆ
ئەی مانگی شکاو
مانگی غەزەل
مانگی مارت
هەشتمەمین ترپەی بە پەلەی
دلی تۆ ئەی مانگی هیلال
مانگی چواردەی
هەر سەر لە ئێوارە گیراو.

مانگی تۆ
ئەی مانگی مات
مانگی لار
مانگی مارت
یادیکە بۆ کوژرانم.
لە ئەوسای پڕ
لە بۆنکرووزی سووتانی ژنانی کرێکارەوە
تا ئەو نێرگزەی کە ئەمڕۆ
بۆ ئەم یادە و بەسۆزەوە
گوڵەکان ئەیدەنە دەستم

هەمیشە لە هەشتی مارتا
هەشت چرکەم لە گیانەلا
هەشت فرمێسکم
لە چاوی خوا
برینم مەکولێنەوە مانگی ئادار
مانگی گریاو
مانگی تەنیا

حیکایەتم
لەو پەیڤە دەستبەسەرانەدا تاساوە
کە پڕن لە وشەی جوانی ئازادی و
باڵی ڕەنگاڵەیی فڕین
ئازارم لە ناو ڕووکەشی
ئەوانەدا هەڵکورماوە
کە میهرەبانی ئەڵێن و
کە قەڵەمیان
گوایە سەنگەر و قەڵغان و ئومێدمانە و
خۆیان تابووتی ژنانن
بە تەنیا هەر لەسەر کاغەز
یان لەسەر ژن
ئینسانن
دەنا گەلێ لە سمیولە نێرەکانی
ڕێگەی دووری پڕ لە گوڵاڵەی قوربانی
ئێمەی وناو

قەسیدەیەکن لە درۆ
هەمان خوێنی باوک و مێرد و
برا و یاری
ئەم ڕۆژهەڵاتە حەقیرە
بەگیانی خۆپەرستیاندا لرفەئەکات.

هەمان حەسار
خەونەکانیان لە گەڵ لەدایکبوونیاندا
بە توندی گەمارۆ ئەدات
بە خۆشیان هەر هەمان حەسار
بۆ ژنانی حەرەمسەرا
خونچەی ئایندەی مێینە
بەرزتر لە دیواری بەرلین و
دیواری بەرزتر لە دیواری دۆزەخ
بۆ حەسارەکانی عومر و
تەمەنمان هەڵئەچنن

حەساری زۆر بەرزتر لە باڵای ئازارمان
بۆ ئازارمان دروست ئەکەن
لەسەربانی حەسارەوە دەتبینین، ئەی دیمەنی جوان!
ڕۆژی هەشتەمی مانگی ساڵ
مانگی شکار
مانگی غەزەل
مانگی مارت.

## گوڵی سوور

گوڵی سوور بووم لەهاتنتا
بەهاری خۆرهەڵات
گوڵی سوور
بەڵام ئەورەنگە شەیدایەم
لە پایزی ئاوابوونتا داکەندووە و
ناپۆشمەوە
تا وەرزی ئایندە و
تا گەڕانەوەی بەهاری بینینەوەت
ناتوانم ئێوارەیەکی ناوەختی تر
هێندەی رەنگی خوێنی رژاوی عاشقێک
سوور بچمەوە.

دڵم نایەت
چی ترگوڵاڵە سوورەکەی
دوێنێ و سبەینێ و ئەمڕۆ بم

دڵم نایەت
بۆ لەمەودا خۆشم بووێیت
شەونمی سپێدەی مەحاڵ
هەناسەی خۆرهەڵات
ئومێدی دوور.

ئەیلوولی ٢٠٠٢

**تۆ**

لە نێوان تۆ و
وێنەکەی رەش و سپی کۆنتدا
سپی بوونی مووی سمێل و
ماش و برنج بوونی قژ و
زۆر گۆرشانی بێ دڵی‌تر رووویانداوە
کەچی خەندە و سەرنجت هەروەک خۆیانن
ئەزانی بۆ؟
چونکە دوو شت
هەرگیز پیربوونیان بۆ نییە
پێکەنین و
سیحری نیگایەکی عاشق.

**بە تەنوورەیەکی کورتی سوورەوە**

مۆدێلێک ئەهێنمەوە
کۆن بووە
لە سەردەمی دایکم و دایکتدا بووە،
مۆدێلی جوانی تەنوورە کورتەکان
لەو وێنە رەش و سپیانە دەرئەهێنم
کە لە ئەلبومی خەیاڵی
هەمووماڵەکانا هەیە

نازانم بۆ
ئێستا شەرم

لە رابردووی خۆی ئەکات
دنیا درۆزنتر بووە

شیعرم بە شەونم خۆی ئەشوێ
ئینجا بە تەنوورەیەکی
کورتی سوورەوە ئەگەڕێ
با ویقاری جلی سەردەم
کەمێ تەریق بێتەوە.

شیعرم قۆڵی دەرئەخات و
قاچ رووت ئەکاو
لاسایی نێرگز و گوڵاڵە و گوڵەباخ ئەکاتەوە.
بە تەنوورەیەکی زۆر کورتی سوورەوە
تۆ شەرم لە ناسینەوەی
خۆم و شیعر و دڵم ئەکەیت
من پێکی نەمری وا بە دەستمەوە
هێندە مەستم
نەمردنت لە پێناوما
لە تاریکیدا ئەبینم و
نە رەتکرنەوەی ناسینیشم لەبەردەم
رووناکیدا
پێت سەیرە بە گوناهێکی
ئەورەی وەکوو نووسینەوە و
بە تەنوورەیەکی کورتی:

جارێک سوور
جارێکیش گوڵ گولینەوە
دڵم لاسایی فریشتە و دۆغدۆڤەکان ئەکاتەوە.
باوەڕناکەیت، چەند لە ژیانی خۆم رازیم
وەختە بڵێم
شیعرم لاسایی ژیانم ئەکاتەوە!
باوەڕناکەیت چەند دۆستی ژیانم
مەرگ وەختە
بۆ ماچێکم سوێی بێتەوە.
ئەو چاوانەی بیلبیلەیان شڵەژاوە
پێت ئەڵێن لە کوێوە
بەرەو کوێوە چووم
ئەو ئاخ و ئۆفانەی
لەو کۆڵان و شەقامانەن
بەدوامدا رژاون
پێیان وایە
تازە شێت بووم.
بە تەنوورەیەکی سووری کورتەوە
هاوار ئەکەم:
بەهار هات
پەنجەرە زووبکەنەوە
لەبەر ئەوەی زوو ئەڕوات
زارم لاسایی هەنگوین و شەکر و شیلە ئەکاتەوە
کەچی بە ژەهری دڵڕەقیی زەمانە ئەمرم و

له وێنه‌ی زستانێكی سه‌رد
ڕۆژمێری ژووره‌كه‌مدا
ڕۆژێكیان ڕه‌ق ئه‌بمه‌وه
ته‌واو ئه‌بم و
ئیتر به‌هارێكی زۆر هار
به‌ ته‌نووره‌یه‌كی كورتی سووره‌وه
دێت لاسایم ئه‌كاته‌وه.

# سۆران حوسێنی

کوڕی مامۆستا شێخ عیزەدینی حوسێنیەو لە ٨ ی خەزەڵوەری ١٣٤٧دا لە گوندی چیچۆڕانی شاری بانە لە دایک بووە.

لە ساڵی ٨٠ەوە خولیای شیعرو ئەدەب دەبێ و لە ساڵی ١٣٧٠ەوە دەڕاتە نێو ئەنجومەنی ئەدەبی شاری بانەوەو تا ئێستا لە دەستەی بەڕێوەبەرانی ئەم ئەنجومەنەیە.

بەرهەمەکانی کە تا ئێستا چاپ کراون ئەمانەن:

- هەساو، کومەڵە شیعر.
- تا ئاربابای خۆشەویست، کۆمەڵە شیعری تاقمێک لە ئەندامانی ئەنجومەنی ئەدەبی بانەیە کە سۆرانیش یەکێکیانە.

- گازە، کۆمەڵە شیعری تاقمێک لە ئەندامانی ئەنجومەنی ئەدەبی بانەیە کە سۆرانیش یەکێکیانە.
- سێ دڵۆپ خوێن، کۆمەڵە چیرۆک سادیق هیدایەت، سۆران حسێنی کردوویە بە کوردی.
- وتوویژ، شانۆنامە. نووسینی محەمەدرەحمانیان، وەرگێڕ سۆران حسێنی.
- بازنەی گڕ، شیعر.
- پەرەژاڵ، شیعر.

## کۆچ

هەر کە شیعر
نەیتوانی بە لانەی وشەی
پەرسێلکەی خۆشەویستی
داڵدە بدات
کۆچ ئەقەومێ
هەر کە وشەم
نەیتوانی ئارامت وەکات
کۆچ ئەقەومێ
کۆچ بێزاری تۆ لە شیعرە
کۆچ دوور کەوتنەوەم لە مانە
کۆچ وە پشت گوێ هاویشتنی
هەرچییەکی بڕێک شەنگ و
بڕیک شیعر و
بڕیک جوانە.

## درۆ

درۆ دەکەن
دەزانین و دەنگ ناکەین کە
درۆ دەکەن:
«لووتی بزووتی سەر وەجاخ سارد و سڕە
شەمچەی سەر تاق و ڕەفحەمان خووساو و خاو
بێ سۆلە لەنتەر و
چلۆسکی ئەم بەرهەیوانە

بێ بڵێسە و تیشک و گڕە»
چی لێ بکەین
لە ئارەزووی محاڵ؟
چی لێ دەکەین
لە چاوە چاوی بەردەوان
لە گوێی بە زۆر کلۆری بێ بەر و بەتاڵ؟
ئەی ئێوە چی؟
چی لە بڵقی سەر ئاو ئەکەن
چی لە قوڵینەی دڕاو
چی لە نەقەڵی رزیوی
پینە و پەڕۆی کڵاو ئەکەن؟
دڵمان بە خوێن
لەشمان بە زام
لە هەیوانمان چرا ئەدزن
لە بەر هەیوانمان تاریکی پیادە دەکەن
نە لە دڵمان
ئەتوانن ئەوین بسێنن
نە لە لەشمان
ئەتوانن هیوا دەربێنن
نە دڵ بە چڵۆسک ئەدەین
نە بە لەنتەری خۆش ئەکەین
شەو بشکێنێ.
شەو خۆی خەریکی کز بوونە و
خۆی لە دۆخی مردنایە

خۆ دەرەقەتی مانەوەی خۆی هەر نایە
لەیلا!
زانایی ژەکی تۆ ئەمژێ
دەسەڵات فرچک لە تۆ وەر ئەگرێ
لەبەر ئەم هەیوانە
بە هەنیسک و گریانەوە
بۆ دەق گرتووی؟
بەم حەسرەتە تاقانەوە بۆ دامردووی؟
هاکا سبەی
یەکێک بە پشت ماڵاندا هات
قولە مشتی پری دەسماڵ
هاکا سبەی بە بن میچی
ئەم هەیوانەوە زرینگا
بۆ گۆوەندی کۆنە شمشاڵ.

من ئەمرم ..........................................................................................................

لە گۆشەی حەرفێکا ماتڵم

پێم ئەڵێ

کە رەزام شکلێکە تا ئەبەد راکێشراو

ئەخوازم لە ناخیا نوغرۆ بم.

***

گەلاوێژ

- پێم وابێ بیناسن-

لە حافزەی پەنجەرەکاندا

لازمە

ئەوەندەیە

تەمایەرە

حەوسەڵەی گەلاوێژ لە دەستما تا ئەڕوا

گەلاویژ کلاوێ خارجی لەسەرما

گەلاوێژ لیباسێ سەربازی لەبەرما

لە خەیاڵتا

شەویک ئەبم بە بیابان

وەکوو شۆستە سەر ئەکەمە سەر خیابان

خیابان، بە هەڵە رۆشت

پارک، بە هەڵە راوەستا

پەرت ئەکریمە ناو خۆمەوە

ژنەکەم نایەوێ باوەڕ کا

من پڕم لە رەنگی لێژایی

ئەو چۆڵە لە دوو سێ سەرەو ژوورکە

دایە!
بە کۆڵوانەکەتەوە گوڵ ئەڕوێ
من ئەگریم
کاروانچی بە دنیاوە ئەشەلێ
یان روو ئەدا،
من ئەترسم
ئێوارەیەک لێوە بئاڵێنە
خوا گەورەیە یان عەکسی تاقەکە سەیر ئەکەم
عەکسێ پڕە لە تۆ
قاپێ پڕە لە من
من لە تاقەکەدا دانێ
کاکەم بە دیوارەکەدا داکوترا
باوکم بە دەم ترسەکانییەوە
دەستی خۆی قورئانێک دەگرێ
کەسێک ئەیوت
کاکەم بە دیوارەکەدا داکوترا
دایکم دنیا دەزریکێنێ
کۆڵوانەکەی پڕە لە کۆڵ
پشتوێنەکەی پڕ لە پاییز
قژەکانی لەئاوا ئەگریا
ژنێک من ماچ ئەکا
پرسەکان رائەخرێن!

٢٠٠٤

**چەشنی خەونێکی سەرلێشێواوە**

لە مێژساڵە
لە باغچەی حەوشەکەماندا
گەڵا وەریوەکانی پاییز
قەتیس ماون.
هیچ درەختێک
داڵدەی ئەم پەرەسێلکە هەڵکورماوەی
رۆحم نادا.
چەشنی خەونێکی سەرلێشێواوە
ئارام ناگرم
لە تۆی هیچ هەناسەیەکدا.
ئەڕۆم
ئەڕۆم
لە حەسرەت ماچێکی دەریا
ئەبم بە دڵۆپێک فرمێسک و
ئەتکێمە داوێنی دایکمەوە
لە مێژ ساڵە
لە جەغزی ئەم مێژووە تەماویەمدا
بەژانی عەشقێکەوە
ئەتلێمەوە
باڵی ئۆقرەم هەڵوەری
ئەی شەپۆلە هەڵچووەکانی
گرکانی سەرم
کەی ئەمگەیەننە

بەردەژانەکەی مریەمی مەسیح؟

۱۳۷۵

**یەکەم کەس** ........................................................................................................

یەکەم کەس بووم
رازی ئاسمان و تەهێنی بارانم
بۆ پەنجەرە داخراوەکان درکاند.
یەکەم کەس بووم
لە پەرستگەیەکی پڕ خوادا
کڕنۆشم بۆ زاتی خۆم برد و
کۆترەکانی ناخم
بوون بە ژێر هەرەسی تاوانەوە.
تاوانم کرد!
تاسەی دارستانێکی بێ بەهارم
لە سەوزایی خوێنی گوناهەکانمدا شوت
لە دۆزەخی ئەم تاوانەدا دەسووتێم
بێگۆناهتر لە فرمێسکی گولەبەفر
تێنووتر لە سەرابی عەشق
دەسووتێم
شەیداتر لە وشەی نامە بێ ئادرەسەکان
لە سەفەری جادە تەنگەکانی رووناکیدا
یەکەم کەس بووم
نائومێدی باڵی لە رۆحم وەردا و
پەنجە بۆشەکانی مەرگم زیارەت کرد

زستانی ۱۳۷٦

## خەوالووترین

خەوالووترین
پەنجەی ئارامش،
منی رابردوو ... و
خەیالانی شێواوت
درۆ!
بالەخانەی دۆڕاو و
دەلەسەی سەپاوی
من و
حەز و
تۆ
خەوالووترین راستی
راستترین درۆ.

## ریگا هەوراز

ریگا هەوراز و
ڕێبوار هەورازتر.
بیر لە چی دەکەیتەوە؟
من خەوالوو
تۆ خەوالووتر
ئێمەی بەرەو نوێنی نەرم و تازە.

**ئیمپراتوور** ..................................................

لە تەک ئاو بپەیڤی یا ئاگر
لە تان و پۆی بووندا گەمەیەکی سادەی
بە پەنجەی منالانەی مردن دەکرێتەوە .
پێش ئەم شیعرەش دەتزانی
با، چ بە دەواری شوێن و
پەرژینی کات دەکات
ئیتر چ چارە
چ چارە
چ چارە؟
بە نێوان شتەکاندا دەگوزەری
نە ڕەنگیان وەردەگری
نەش فامیان دەکەی .
لە تەک هەڵمی بوون و
کزەی نەماندا
گەمەیەک دەکەی سەیر
سەیر .
سەراسیمە بەرەو کۆتایی دەچی
وچانێک،
وچانێک تا بزانی
ڕێگا فریوێکی قەشەنگە
بۆ لە بیر چوونەوە
شەرابیش خەیاڵێکی سوور باو
بۆ لە بیر بردنەوە
نە تێکەڵ بوونە
بە هاودەستی ئەستێرە

دەگەڵ شەو سەما کردن
نە ژیانە.
ئمپراتوورتر لە من کێ؟
کێ؟
کێ؟
هێورتر بپەیڤە
هەور ماندوون،
بێ دەرەتانن گەڵا
لە سەر خۆ بە،
دەبێ ئاوێتەی شتەکان بیت
مانەوەت بەندە بەم شتە سادانەوە.
چی تر لە ماناکان ناکۆڵمەوە
بە درەوشانەوەی هیچ شتێک سەرسام نیم
گرینگ تێگەیشتن لە زمانێک بوو
بێ دەلالەت،
چ دەلالەتێک لە بێ دەلالەتی
بێ ماناتر؟
چ دەلالەتێک لە ماناکانی خۆم
خەوفناکتر؟
ڕێگا تا دێت کورتتر دەبێتەوە
چارەیەک،
لێدەگەڕێم ڕێگایەک
بە بناریکیم بسپێرێ

## جەمال نەجاڕی

سـالی ١٩٧٩ لـە شـاری مەهابادلـە لـە دایـک بووە.لە شاری بۆکـان خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی و دواناوەندی تەواو کردووە. ئێستا لە بەشی کوردی کۆلێژی زمانی زانکۆی سەلاحەدین لە هەولێر، خوێندکارە.

هەروەها سەرقالی نوسین و وەرگێرانە لە بوارەکانی ئـەدەب و رۆشـنبیری ·

ئێـستا سـەرنووسـەری سایتی دەنگی کوردستانە

.

www.kurdistanradio.net

**دوو کەس بووین** ........................................................................

تۆ لە نێوان من و ئەم شەقامە بێ عەشقەدا سەفەر دەکەی،
هێشتا مەرگمان نەبینیوە،
هێشتا مەرگمان نەناسیوە،
ژین بۆ تاکسی و
پارە بۆ نان و
ئەوەندەی موسافیر بۆ گەیشتن،
هیچ ڕێگەیەک ئاوەها دوور نەبوو.
***

ئێمە لە مێژووی بێ سەر و شوێنی باران و
هەناسە ماندووەکانی ژێر بەفر دەگەڕێینەوە.
تەمای چیم بێ لە چەتر
کەتەنیا جێی تۆ دەبێتەوەو بەس.
***

ئێمە لە چوارڕێیانی پێکەوەبوون،
بەیەکەوە پیکەنین،
چی ئەنفال و هەڵەبجە بوو لە بیرمان کرد.
سبەی ژیان چی بەسەر ئەم شارە دەهێنێ؟ مەڕۆ!
تۆ کە حەزت دەکرد ڕەنگی تاکسییەکان «سەوز» بێ و
نارنجی تەنیا لای تۆ پرتەقاڵ بوو.
من کچێ دەناسم،
نارنجەکانی سەرسینگی بە مانتۆ دەشاریتەوە،
تەمای چیم بێ!
کە تەنیا خۆی لە بینینیان تێر دەخواو

بیر ناکاتەوە ئەم ڕێیە تا کوێی سەفەر دەڕوات.
نە بە من دەگەڕێتەوەو
نە ئەویش دەمانگەڕێنێتەوە رابردوو
***

تۆ وتت هەمیشە دەریا بکە بەرت،
تا بە شینی ئەم عەشقە شاعیر بم.
ئەرێ ئەم شارە لە دووکەڵدا خنکا
یان هەواڵنێرەکان درۆیان کرد؟
***

ئیمە هیشتا گەرمای مەرگمان نەچێشتووە،
-دوو کەس بووین-
لە باوەشی شەقامێکدا فێربووین
بە زووترین کات ژمارە تەلەفۆنەکان لەبیر بکەین،
تا سبەی لە هەراسی «٥٠٠٠» و «١٨٢٠٠٠» ژمارە نەترسین.
ئیمە لەگەڵ رۆحی خۆمان،
لە ژێر باراندا سەمامان کرد.
تەمای چیم بێ کە چەترێک نەبوو تا ئێوارە لە ژێریا بحەسێمەوە.
***

من پێم وتی: بهێڵە با پەپوولە بباریّ و پاییز هەڵوەریّ،
ئەمانەم لە ڕەشنووسی دوایین شیعری دەفتەرەکەم هەڵبژارد
کە خەریک بوو لەبیر دەچوونەوە
***

دەچۆن ئارام بگرم،
من دەمێکە لە تارمایی ئەم شەقامەدا وێڵم،

-دوو کەس بووین-
بووکە شانۆی سەرشەقام و خەڵک قاقاپێمان پێدەکەنن.
منالانی هەڵەبجەو ئەنفالیش
بۆنی بارووت و خۆڵەمێشیان لێدەهات.
مەڕۆ!
ئەم سەوزانە تا دارستان سەفەر ناکەن،
پیاوکوژن
ئەم شۆفێرانە دەمێکە جەستەی هەتاویان ناشتووە.
کە گۆڕە بەکۆمەڵەکان و شارە رووخاوەکان
هەموویان بی ئادریس و بی ژمارە تەلەفۆنن.
***

ئیمە ئەمجار لە تراژیدیاییەکی نوێتر دەگەڕێینەوە لاتان.
-دوو کەس بووین-
هەرخۆمان، خۆمان فریوداو
هەر خۆمان، خۆمان ئاشق کرد و
هەر خۆشمان، خۆمان کوشت!
***

هیشتا چاومان بە باران تەڕ نەبوو
بەفر دایکرد.
هیشتا سەیری نارنجەکانم نەکردبوو،
تاکسییەک هەواڵی دارستانی لێمان دەپرسی.
***

تۆ پێت وتم:
دەست لە ناو دەستی ئەشق نێ با تەنیا نەبم

پەپوولە دەوەری و

پاییز دەباری بە سەرماندا

***

ئیمە خۆمان بە خۆمان وت:

قەت لەسەفەردا شیعر نەخوێنینەوەو

گەمە بە وشەکان نەکەین،

شەقامەکان بنووسین و

هەواڵی ئێوارەیەکی دووکەڵی بخەینە ناو رۆژنامەیەکی

بەیانییەوە.

***

من هەمیشە دەریا دەپۆشم،

تۆ لە چاوما پۆل پۆل باران هەڵفڕینە و

شەپۆل شەپۆل وشەی تازە ببارێنە بەسەر سینگ و نارنجەکانا

تەمای چیم بێ،

کە گاڵتە بە خۆم بکەم و بە تاکسییەکانیش،

تۆ قاقا پێبکەنی بەم شیعرە.

***

هێشتا لە رەشنووسی ئەم سەفەرەدا،

تۆ لەنێوان من و ئەم شەقامە بێ ئەشقەدا موسافیری

بحەسێوە،

لە ژێر چەتری بێ باراندا،

نەفرەت لەوانەی حەزیان لە نارنجەکانی سەر سینگتە!

ئاگادار بە

ئەم شۆفێرانە دەمێکە جەستەی هەتاویان ناشتووە.

***

من پێم وتی بۆنی عەتر و باران جێ مەهێڵە،
ژمارەکان مەدە دەست ڕەشەبا،
بیاندڕێنە نامەکانی سەفەرو
دارەکانی دارستان و
هیچ ڕێگەیەک ئاوەها دوور نەبوو.

***

تاوێک لە ژێر ئەم چەترەدا بحەسێوە،
باران دەمێکە نابارێ و
شار لە دووکەڵی ئێوارەدا
هەر دوور و دوور و دوورتر دەبێتەوە لێمان
وەک گەڵای پەپوولە و
ڕۆحی سەوز هەڵگەڕاوی پاییز.
-ئیمە دوو کەس بووین-
من و
خۆم و
سێبەرەکەم.

## کەریم دافیعی
## (ک.د.ئازاد)

ساڵی ١٣٣٩ لە ناوچەی سەردەشت لە دایک بووە. خوێندنی لە شارەکانی سەردەشت و بانە درێژە پێ داوە؛ تا ساڵی ١٣٦٣ لە زانکۆی تەوریز لە خوێندن بۆتەوەو لیسانسی وەرگرتووە. بڕوانامەکەی لەسەر کوردانی سۆران نووسیوە.

لە ساڵی ١٣٥٥ەوە هۆگری شیعرو ئەدەب بووەو لەو کاتەوە تا ئێستا خەریکی چالاکی ئەدەبییە.

ساڵی ١٣٦٨ لە گەڵ تاقمێ لە هاوالانی، ئەنجومەنی ئەدەبی شاری بانە دادەمەزرێنن.

تا ئێستا زۆربەی شیعرەکانی لە کۆڤارو رۆژنامەکاندا چاپ کراون.

## بۆ جودایی

زۆرم پێ وت:
ئەگەر مەیلی هەتاوت کرد
پێدەکەنم
پڕ بە کوێستان و دەشت و دەر
ئەگەر تاسەی بارانت کرد
تێر تێر دەگریم
وەک بارانی بە بێ لەمپەر
ئەگەر مەرگی منیشت ویست
ئەوە سەر و ئەوەش خەنجەر
بەڵام هەرگیز رازی دڵم
مەڵێ بەوانەی بێ خەبەر.

***

زۆرم پێ وت:
سوێندم دا سەد سوێندی خوایی
بەڵام داخم
رازی دڵمی وت لە هەر جێ
بۆ هەر کەسێکی ئاسایی
هەر ئەو کارەش منی هان دا
بۆ جودایی،
بۆ تەنیایی.

## شەیدایی

دەستەکانم،

به ئاسمانی ئەوینی تۆ نەگەیشتن
لە جومگەوە لێم کردنەوە و
لە ئاسمانم هەڵاویشتن!
چاوەکانم،
رووی دیتنی تۆیان نەبوو
ماچی سەرنێزەم پێ کردن
تا مەحرەمی بەژنی تۆ بن
هەتا مردن.
قاچەکانم،
رێیان نەبردە جێ ژوانت
بە تیغی جەللادم بەخشین
تا فڕینم بەرەو لای تۆ
مسۆگەرکا
باڵی ئەوین.